ناوی کتێب: فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی - بەرگی یەکەم
نووسینی: د. موحسین ئەحمەد عومەر
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٤٩
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٦٩)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ.

## بەرایی

زمان و ئەدەبیاتی کوردی ئەوەندە زۆر نییە کەوتۆتە ناو بوارێکی دیکەی گەشەسەندن و ئاڵۆزبوون. من ناو لەم بوارە دەنێم، ڕەخنە و لێکۆڵینەوە. ئەمەش تاڕادەیەکی زۆر مێژوویێک و ئاستێکی ئەدەبی و هونەری تازەی هەیە. لەم بارەیەوە ئەگەر بەهەڵەدا نەچم، دەتوانم سەدەی بیستەم بەسەدەی سەرهەڵدانی ژانرە تازەکانی ناو ئەدەبیاتی کوردیدا دابنێم. بێگومان خەیاڵ و جیهان و زمانی ئەدەبی و پێویستییەکانی ئەدیب و هونەرمەند و خوێنەری پێش ئاڵۆزبوونی ئەدەبیات زۆر جیاوازە لە هی سەردەمی هاوچەرخ. هەڵبەت ئەم کتێبەی بەردەست وەک پڕکردنەوەیەکی ئەو کەلێنە خۆی پێشان دەدا. فەرهەنگی زاراوە ئەدەبییەکان، فەرهەنگێک نییە وشە بەرامبەر وشە بێ، بەڵکو فەرهەنگێکی مانا لێکدانەوە و گەڕان و پشکنینە لەسەر هێڵێکی ڕاست و قووڵ لە دەورەی لێکسیکێکی ئەدەبی و ڕەخنەیی. تا ئێستا تاقیکردنەوەیەکی لەم جۆرە پێشتر نەکراوە، ئەمەیان هەوەڵینە. لە نووسین و ئامادەکردنی ئەم فەرهەنگە ڕوانگەیەکی ئەدەبی و کولتووری (شارستانی) لەبەرچاوگیراوە، چونکە ئێمە ڕاستەوخۆ پشتمان بەکۆمەڵێک سەرچاوەی ئەورووپی بەگشتی، فەرەنسی بەتایبەتی بەستووە. لەبەر ئەوە، ناکرێ ئێمە ئەو دیاردە و چەمکە ئەدەبی و هونەرییانەی ئەورووپی بێ سەرنج دان ڕاستەوخۆ بهێنینە ناو ئەدەب و لێکۆڵینەوە و زمانی کوردی و ڕۆشنبیری کوردی. ئێمە بەهیچ شێوەیەک بەلای ئەو چەمک و دیاردانە نەچووین کە تایبەتن بەئەدەبی ئەورووپی خۆی، بەڵام ئەگەر دیاردەیەک یان زاراوەیەک لە هەردوو لا هەبێ، هەڵبەت بەدوای بەرامبەرە کوردییەکەی گەڕاوین. بێجگە لەمەش، ئێمە هەوڵمان داوە لەپاڵ زاراوەکان نووسەر و ڕەخنەگرە گەورەکانی جیهانیش پێشکەش بکەین، کە خاوەن ڕوانین و تیۆری سەربەخۆی ڕەخنەیین. ئەم کتێبە، لە ڕوانگەیەکی تیۆری و ئەکادیمیانە ئامادەکراوە، نووسەر خۆی نەداوە لە درێژدادڕی – Tautologie، بەڵکو ئەوەی پێویست و گرینگ بووە بەزمانێکی هاوچەرخ

نووسـراوه. ئەم بەرگـەی بەردەست کـە بریتـیـیـە لـە پۆلێک زاراوە، پێشـتـر بەزنجـیرە لە گۆڤـاری ڕامـان بڵاوبـۆتەوە. بەرگی دووەمـیـش بەهەمـان شـێـوە دەبێ، واتە ئەم فەرهەنگە بەشێنەیی و بەقووڵی ئامادە دەبێ، لەو بڕوایەدام ئەم شـێـوازە بۆ کـاری لەم جـۆرە زۆر گـونجـاوە. ئیـتـر بەهـیـوای بەردەوامی. بێگـومـان سـوپاسی گـشت ئەو برادەرانە دەکـەم کـە بەڕاوێژە جـوانەکـانیـان هانیـان داوم ئەم کـارە بکەم. لەوانە کـاک ئازاد عـەبدولواحـیـد و کـاک سەعدوڵڵا پەرۆش.

ئەم فـەرهەنـگە سـەرچاوەیەکی گـونجـاو و لەبارە بۆ گـشـت ئەوانەی لێکۆڵینەوە و ڕەخنە دەنووسن، هیوادارم بەئەمانەتەوە سوودی لێ وەربگرن و ماندووبوونی ئەوانی دی لەبیر نەکرێ.

* بیبلۆگرافیای سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە دوا بەرگی هەمووی بەیەکەوە دەنووسرێ.

د. موحسین ئەحمەد عومەر

## مەجاز - ئەلیگۆری ALLEGORIE

بەگشتی مەجاز لە پێناسەکردنیدا بەڕەمز Symbole بەراورد دەکرێ. ئەم بەراوردکردنەش وەک گەشەسەندنێکی لۆژیکی و وێڕای لێکۆڵینەوە و وردەکاری هاتووە. بەم جۆرە، دەبینین لە شیعری لیریکی وێنە (Image)ی گوڵەباغ Rose زۆرجار وەک ڕەمزی جوانی و پاکیزەیی و خۆشەویستی دەردەکەوێ. شتێکی ئاسایییە سەرنجی خوێنەری ئیمڕۆ لەنێوان ڕەمزو مەجاز، بەلای یەکەمدا بشکێتەوە کە دەوڵەمەندتر و قووڵترە، بەڵام هەندێ جار ئەم ئەفزەلییەتەی ڕەمز دەگەڕێتەوە بۆ ناوەرۆکی تەسک و ڕووکەشی مەجاز، لەمەش تاڕادەیەک (لە تەواوی ئەدەبیاتی جیهان) ڕێزمانناسانی سەدەکانی ناوەڕاست و ڕەخنەگرە هاوچەرخەکان بەیەک ئاست بەرانبەر بەم ناوەرۆکە بەرپرسیارن.

بۆ نموونە لەلای یۆنانییەکان (گریکەکان) زاراوەی (a^^nyopia) درەنگ، لە سەردەمی پلوتارک شوێنی زاراوەی (Utovoia)ی گرتەوە بۆ پێشاندانی (مانای شاراوە)، هەڵبەت بەپێی فەرەزییە و بەخششە هەستیارەکانی زمان لەو سەردەمە، کە لەناو هونەری گێڕانەوە (Narration) یان وەسف کردن (Discription) دەبینران.

## دووبارەبوونەوە ANAPHORE

لە خیتابی کلاسیکی وەک دیاردەیەکی ڕەوانبێژیی تایبەت بەشێوازی گوتن و نووسین ناسراوە، ئەمەش بریتییە لە دووبارەکردنەوەی وشەی سەرەتایی کۆمەڵە ڕستەیەک یان یەکەم دێری ئەو نووسینە (بەیت بۆ شیعر) بۆ بەدەستهێنانی هاوسەنگی و جۆرێک لە ڕیتم، هەڵبەت بەمەبەستی بەهێزکردنی بابەتی سەرەکی نووسینەکە یان ئاخاوتنەکە وەک:

«... کوردستان تاقە ئاواتی ژیانم، کوردستان لانەی شێر و نەبەردانم، کوردستان سەرچاوەی ژین و مانم...».

لە شیعری کۆن و هاوچەرخی کوردی نموونەی لەم جۆرەمان زۆرەو لە

گەلێک لە نووسینەکانیش دەست دەکەوێت. ئەم دیاردەیە لەلای زمانناسە هاوچەرخەکان بۆ هەمان مەبەست، بەڵام بەچەشنێکی دیکە سوودی لێ وەرگیراوە. وەک دارشتنێکی سینتاکسی. بۆ نموونە لەم دارشتنەی خوارەوە بابەتی سەرەکیی لێدوان و ناوی ئەو کەسەی کە دێت بەدووبارەکردنەوە بەهۆی یەک شت یان یەک ناو دارێژراوە، وەک: «... پیاوێک هات منی بینی؛ ئەو پیاوە کڵاوێکی لەسەر بوو». یان «... پیاوێک هات منی بینی، ئەو پیاوەم بینی کە دەبووە ئەو پیاوەی هات من ببینێ، بینیم». «... پیاوێک هات من ببینێ کڵاوێکی لەسەر بوو. ئەو پیاوە کڵاوێکی لەسەر بوو دەبووە ئەو پیاوە هات من ببینێ کڵاوێکی لەسەر بوو.»

## قسەی نەستەق APHORISME

ئەفۆریزم، بریتییە لە ئاخاوتنێکی چڕی مانادار کە دەدرێتە پاڵ کەسێک، نووسەرێک یان مرۆڤێکی ناودار. شێوەی پەندی هەیە، بەڵام وەکو ئەویش نییە. نووسەر یان هەر مرۆڤێک لە رێگای ئەفۆریزم تەواوی بیری خۆی لە ڕستەیەک کۆدەکاتەوە بەچەشنێک وەک ئاوێنە ئەو بیرەی هەڵیگرتووە تێیدا ڕەنگ بداتەوە.

رامبۆ

نیچە بەئەفۆریزم لە سەرەتای نەخۆشییەکانی دەڵێ: «بەدوای فەردە قورسەکانی خۆم دەگەڕام، ئەوەبوو خۆمم دۆزییەوە». خاسییەتی قووڵی ئەفۆریزم ئەوەیە مرۆڤ لە رێگای ئەمەوە تێبینی بیر و بیرکردنەوەی خۆی دەکات، هەرچی (پەند = حیکمەت = Maxime)ە و جیاوازییەکەی لەگەڵ ئەفۆریزم دەگەڕێتەوە بۆ لایەنە گشتییەکەی و تێبینی یەکێک بۆ بیر و بیرکردنەوەی یەکێکی دیکە. بەکورتی

ئەفۆریزم پەندێکە یان چڕکردنەوەیەکی مانادارە مرۆڤ بەتێبینی ناوەوەی خۆی دەری دەبڕێ، هەرچی پەند یان حیکمەتە Maxime زیاتر تێبینییە بۆ دەرەوە، بۆ سەر ئەوانی دیکە.

یەکێکی دیکە لە جیاوازی و خاسییەتەکانی نێوان Maxime و ئەفۆریزم، ئەوەیە یەکەمیان گەڕان و بەدواداچوونی حەقیقەتی تێدایە، بەڵام ئەفۆریزم بەقەد نیوەی ئەمە توانای هەیە، یان لە ڕاستی نزیک دەبێتەوە. یەکێک لە ئەفۆریزمە هەرە ناودارەکانی ئەدب قسەیەکی نەستەقی ڕەخنەگری فەرەنسی (سان بۆف)ەکە دەڵێ (مرۆڤ خۆی شێوازە)...

**ئۆتۆماتیزم (نووسینی ئۆتۆماتیکی)** Automatisme

ئۆتۆماتیزم، دیاردەیەکی ئەدەبی و هونەریی ڕۆژئاوایە. مێژوو و سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەدەب و هونەری ئەوروپی پاشان ئەمەریکی.

لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا، تێکەڵی ئەدەب و هونەری ڕۆژهەڵاتیش دەبێ. ئۆتۆماتیزم پێچەوانە فەرهەنگییەکەی هۆشیاری و ئازادی و ڕێککەوتە. بریتییە لە کردەیەکی نائیرادی.

کلێست (Kleist) لە (دەربارەی شانۆی الدمی) دەڵێ: «لە جیهانی ئۆرگانی (ماددی)، بەقەد ئەوەی بیرکردنەوەی هۆشیارانە تاریکترە یان لاوازترە، بەڵام بەخشندەگی پڕ لە ڕۆشناییتر و سەرکەوتووانە دەچێتە پێشەوە.» دەکرێ ئەمە بەپەندێکی جیهانی دابنێین کە جوان پێناسەی ئۆتۆماتیزم دەکا. ڕەنگە چەمکی (تۆقانی شیعرییەت= Fureur Poe-tique) بەو چەشنەی لەلای ئەفلاتوون هەیە لە سەدەی شازدەمەوە جارێکی دیکە سەرهەڵدەداتەوە کۆمەڵێک شاعیر دەگرێتەوە و بەسەر یەکێکی وەکو مۆنتەین Montaigne-یش باز نادات کە لە زوویێکەوە پەنجەنومای ئەو لێکجیاکردنەوەیەی کردبوو لە نێوان (بیرکردنەوەی هۆشیارانە- یان بیرکردنەوەی ئاگایانە) و (بەخشندەگی)، بەڵام فەلسەفەی سروشت و ڕۆمانتیزمی ئەڵمانی، پاش سەرکەوتنەکانی فەلسەفەی ڕۆشنایی، باشتر

دەتوانن ئەم بەشــە تاریک و نەناســراوەی ئەقڵ یان ڕوح بنرخــێنن. ئەم حــاڵەتەش لەلای کلێــست (Kleist) بەشــەورۆ (=Somnambulisme) ناســراوە کــە لە ڕێگای ئەمــەوە دەتوانین، پەردە لەســەر ئەو حــاڵەتە (ئۆتۆماتە)ی هەیە لەناو هەریەکێکمان دەستنیشانی بکەین و بیناسینەوە. ئەم حاڵەتە (ئۆتۆماتە) لەگەڵ شەپۆلی ڕوحانیەت لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم وەک حەقیقەتێک دەردەکەوێت، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە هیچ شــێــوانێک نەکــەوتۆتە ناو ســروشت و نەژادی، وەک لە ســەردەمی (تەمەلوک= Possessiones)ی سەدەکانی ناوەڕاست وایان بیردەکردەوە کە ئەوەی لە خەوی ئۆتۆماتیکی بەدیاردەکەوێ، گوایە پەتی ڕوح لە دەرەوە ڕادەکێشێ، ئەمەش نەک وەک فێڵێک، بەڵکو وەک گیانی هەراسان کراوی گۆڕ (ترس لە مەرگ). سوریالیستەکان (Surealistes) جوان تەعبیریان لەم حاڵەتە کردووە، بەوەی ئەو کەسەی سەرەنجام وەدەستی دێنین، یەکێک نییە لە جەستەی خۆی جیاکرابێتەوە و ئامادەیە هەر چ شتێک بەدەمیدا بێ بیڵێ، بەڵکو ئەم کەسە یەکێکی سەراوبنە، هەروەک نیگاری کەسەکانی سەر کاغەزی یاریی قومار.

نووسینی ئۆتۆماتیکی، تەنیا بەهۆی سوریالیستەکان دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر خاسییەتی شیعری پڕاوپڕی خۆی. یان ڕوونتر، ئەوان دەیکەنە بنچینەیەکی تیۆری بۆ ڕوانینە ئەخلاقی و جوانیناسییەکەیان، چونکە ئەوان پێشتر ئاگاداری ئەو دیاردەیە بوون کە بەهۆی نائاگایی دەتوانرێ پێوەندیی ئۆتۆماتیکی دروست بکرێ. شیکردنەوەی دەروونیش ئەمەیانی بۆ بەڕاست دەگــێــڕێ، بەڵام فــرۆید (Freud) و هاوڕێکانی وەک سوریالیستەکان لە (نائاگایی) چاوەڕێی پەیامی وەک یەک ناکەن.

ئەگەر دەروونناسەکان (فرۆید و هاوڕێکانی) سەر بەتاریکایی ناوەوەی دەروون دادەگرن، زیاتر بۆ دروست کردنەوەی دواتری ئەقڵی مرۆڤە.

هەرچی برۆتۆن و هاوڕێکانییەتی ئەوان دەیانەوێ ئەو دەروونە تەواو بکەنەوەو ئەو (من)ە نیگەرانەی خۆیان بۆ هەتا هەتایێ تێدا نقوم بکەن.

هەرچۆنێک بێت، لەگەڵ ساڵی ١٩١٩دا، برۆتۆن Breton و سوپۆ Sou-pault و پێیرێ Peret و دێسنۆس Desnos و ئاراگۆن Aragon و ئێلوار Eluard و ئارتۆ Artaud و ڤیتراک Vitrac، ئەو گەنجینە بێ ئابڕووەی کە لە قووڵایی تاریکستانی گیان دەریان هێنابوو، دەیخەنە سەر مافووری ڕزیوی مرۆڤایەتی، پاشان شاعیران و نووسەرانی دیکەش، هەمان ڕێگا دەگرن، وەک: لیریس Leiris و شار Char و سێزێر Cesaire و دوی Duit و دوپرێ Duprey... هتد.

هەندێکیان تا سەر درێژە بەم میتۆدە نادەن، هەر زوو برۆتۆن دژیان قیت دەبێتەوەو دەڵێ: «ئاوی کاریز بۆ ئاشە گچکەکەی ناوبانگی ئەدەبیی خۆیان ڕادەکێشن. بێگومان ئامانجی حەقیقی نووسینی ئۆتۆماتیکی بۆ ئەوە نییە مینای کتێب فرۆشەکانی پێ برازێتەوە، بەڵکو بۆ تەعبیر کردنە لە کاری ڕاستەقینەی بیر».

ئەم پێوەرە ڕەخنەییە، لەو دەمەی (مانفێستی سوریالیزم) ڕۆژی بینیوە، ڕەنگدانەوەی خۆی بەسەر تەواوی شیعردا پەخش کردووە، بەڵام ئایا ناتوانین ئەو پرسیارە بکەین کە نووسینی ئۆتۆماتیکی بەو شێوەی برۆتۆن خەونی پێیەوە دەبینی یان دەیویست، نەیتوانی ببێتە شێوازێکی ئەدەبی، ئەدەبەکەی دیکە لەناو ببات، بێ ئەوەی بەقووڵی ژیان بگۆڕین دەنووسرێت؟.

لەلایەکی دیکە، لە بواری هونەر، هونەری ئەبستراکت، بەتایبەتی ئەبستراکتی لیریکی، زیاتر قەرزداری ئۆتۆماتیزمە وەک لە سوریالیزم، نموونەش بۆ ئەمە، کارە نایابەکانی کاندنسکی- Kandinisky-ن لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. لە هونەری نیگارکێشی سوریالی هەردەم ڕوخسارە ئۆتۆماتیکییەکان بەهۆی هەندێ خاسییەتی عەفەوی و پەلە دەدۆزرێنەوە، ئەمەش لەلایەن نیگارکێشانی وەک:

(ئارپ Arp و ماسۆن Masson و میرۆ Miro و ماتا Mata.) هەستی

پێ دەکرێ، یانیش بەهۆی جۆرێک لە تەکنیکی میکانیکی وەک ڕووشاندن و (ئەو شێوە نیگارانەی لەسەر کاغەز دەیکەن بەمەبەستی گواستنەوەی بۆ سەر دارو شووشە)، بەڵام هێشتنەوەی لەسەر خام، وەک کارەکانی ماکس ئەرنست Max Ernst و دۆمینگێز Dominguez.

پێرس

لەگەڵ جەنگی جیهانی دووەمدا، بوونی هەندێ نیگارکێشی سوریالی لەسەر خاکی ئەمەریکا، ئەنجامەکەی دۆزینەوە و بڵاوبوونەوەی ئۆتۆماتیزمە لەلایەن کۆمەڵێکی دیکەی نیگارکێش و پەیکەرتاش. لەم بارەیەوە ژولیان لێڤی Julien Levy کە لە بارەی گۆرکی Gorky (نیگارکێش) دەدوێ، ئەم دۆزینەوەیە بەرزگاربوون دادەنێ. لە ساڵی ١٩٤٦ بەولاوە، دەیان هونەرمەند خۆیان لەناو ئەم دۆزینەوەیە دیتەوە، بەتایبەتی نیگارکێشە (ئینتیباعییە ئەبستراکت)ەکان وەک دوکوونینگ De Kooning و پۆلۆک Pollock و ڕۆتکۆ Rothko و کۆمەڵێکی دیکە. ئەمڕۆش ئۆتۆماتیزم بەردەوامی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی شاراوە هەستی پێ دەکرێ.

**یاداشت** Autobiographie

یاداشت (کە وشەی بیرەوەری یان سەرگوزەشتە-شی بەرامبەر دادەنرێ،) بەقەد ئەوەی جۆرێک یان فۆرمێکی ئەدەبییە، بەهەمان شێوە بریتییە لە کردەیەکی کۆمەڵایەتی، چونکە ئەو (من)ەی بەهۆی ئەم جۆرە نووسینە، خۆی بەخوێنەرانی نادیار دەناسێنێ، بوونەوەرێکی خەیاڵی نییە، بەڵکو حەقیقییە و بەچەشنێک لە چەشنەکانی دەیەوێ ڕاستی بگێڕێتەوە یان خوێنەران و هاوچەرخەکانی خۆی بورووژێنێ، ئەمەش بەهۆی پێشاندانی

ژیانی ڕابردووی و سەرەنج ڕاکێشانیان بۆ ژیانی ئێستای و هەروا بۆ بەڕاستەقانی گەڕاندنی پێوەندییەکانی ڕابردوو و ڕووی خۆ سپی کردنەوە. لێرەشەوە خوێنەر، وێڕای بوونی فزوولیەتێکی مرۆڤانە و مێژوویی، هەوڵی ئەوەی لە لا دروست دەبێ، یەکێک یان ئەو (من)ە لە ناوەوە بناسێ، لە هەمان کاتدا بەشداری لە پێوەندییە مێژووییەکان بکا، لەم هەڵوەستەدا ئەو ئینتیباعە لەلای خوێنەر دروست دەبێ، ئەویش بیر لە ناسنامەی کەسایەتیی تایبەتیی خۆی بکاتەوە.

ئەم فزوولییەتە مرۆڤانەیە کە وەک دۆزینەوەی جیهانێک هەستی پێدەکرێ، وا لە خوێنەر دەکا بەرامبەر یاداشت کەمێک چاوپۆشینی هەبێ و گوێ بەبەهاو جوانکارییە ئەدەبییەکان نەدات، لە کاتێکدا کە ڕۆمانێک یان کتێبێکی خەیاڵی دەخوێنێتەوە، هەمان چاوپۆشینی نابێت، بەڵام یاداشت هیچی لە کارێکی دیکەی ئەدەبی کەمتر نییە، لێرەوە ئەگەر نووسەر بەشێوەیەکی ڕەسەن تاوتوێ لەگەڵ زمان بکا، نزیکترین ڕێگا بۆ گەیشتن بەحەقیقەت دەدۆزێتەوە.

ئەم ڕوانینەی سەرەوە، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (ئیعترافات- Con-fessions)ی ژان ژاک ڕوسۆ کە لە ١٧٦٥ بۆ ١٧٧٠ نووسیویەتی و لە ساڵی ١٧٨٢ و ١٧٨٩ چاپ کراوە. ئەم ڕوانینە لەو سەردەمە، وەک شۆڕشێک بووە کە ئەو (من)ە یان نووسەری یاداشت لە گۆڕینی تێگەیشتنەکان و چەمکەکان کردوویەتی، چونکە یاداشت هیچ کاتێک فۆرمێکی ئەدەبی بەردەوام نەبووە، لە هیچ شارستانییە کۆن و ناسراوەکان بوونی نەبووە.

لەناو کولتوور و ئایینی ئیسلام، وەک دیاردەیەکی ناپەسند سەیری کراوە. بۆ یەکەمین جار، بڵاوبوونەوەی لە ڕۆژئاوادا، وردە وردە لەگەڵ سەردەمی بووژانەوە (Renaissance)، بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا سەری هەڵداوە و پراتیک کراوە. لەلایەکی دیکەوە، وەک یەکێک یان لایەنێک لە (مافەکانی مرۆڤ) حسێبی بۆ کراوە،

ئەمەش بەتایبەتی لەساڵی ۱۷۸۹دا، لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی، بەڵام بەگشتی، سەرهەڵدان و بووژانەوەی یاداشت زێدەتر دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدان و بووژانەوەی فەردییەتی بۆرژوازی، بێجگە لەم لایەنە سەرەکییانە، دەشێ کۆمەڵێک فاکتەری دیکەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و شارستانی و مێژوویی لە پاڵ پەیدا بوونی ئەم جۆرە ئەدەبییە بدۆزینەوە.

لەم ڕووەوە دەشێ پێش هەموو شتێک، بیرمان بۆ حیکمەتەکانی یۆنانی و ڕۆمانی پێش مێژوو بچێت کە بە(هونەرەکانی خود یان هونەرەکانی تایبەت بەگیان) ناسراون.

دەبینین ئەم بیرە لە سەردەمی بووژانەوە سەرلەنوێ لە لایەن مۆنتێین (Montaigne) لە کتێبە بەناوبانگەکەی (مەقالەکان= Essais) کە لە ساڵی ۱۵۸۸دا بڵاوبووەتەوە، زیندووکراوەتەوە.

خاڵێکی دیکە کە ڕۆڵی گرینگی لە سەرهەڵدانی یاداشت هەبووە، زیندووکردنەوەی ئەم حیکمەتانەی سەرەوە بووە لەلایەن کریستیانییەوە خۆی، بەو مانایەی کریستیانی مرۆڤ فێری ئەوە دەکات بەدوای ئارامیی گیانی خۆیدا بگەڕێ. لێرەشەوە، سەرنجمان بۆ یاداشتی پیاوە ڕوحانییەکان دەچێت، وەک (ئیعترافات)ی قەدیس (سان ئۆگوستا- Saint Augustin) کە لە نێوان ساڵانی ۳۹۲ و ٤٠١دا نووسراون.

دەتوانین بڵێین (ئیعترافات)ی ژان ژاک ڕوسۆ خاسییەتی نوێ و تایبەتی داوەتە ئەم فۆرمە ئەدەبییە. ئەمەش زیاتر لەو بیرە کۆدەبێتەوە کە هەموو مرۆڤێک لە ڕێگای مێژووی فەردیی خۆیەوە دەناسرێ، بەتایبەتی بەهۆی سەردەمی منداڵی. بەم چەشنە، یاداشت، دەبێتە نووسراوێکی واقیعی تاکە کەسێک و گرینگی بەئەفسانەکانی سەردەمی منداڵی دەدا.

هەر لەو سەردەمەوە، یاداشت وەک فۆرمێکی ئەدەبی، بەچڕی کەوتۆتە ناو ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا و ئیمڕۆش لە بواری تیۆری، وەک پێناسە و لێکۆڵینەوە، کێشەی یان گوتارێکی ڕەخنەیی ئاڵۆز و قووڵی ناوەتەوە.

یاداشت لە ئەدەبیاتی کوردی، وەک فۆرمێکی ئەدەبی بۆ نیوەی یەکەمی

سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. بەزۆر شێوە، دەتوانین بڵێین بەشێوەیەکی واقیعی لەگەڵ (یاداشتەکانم)ی ڕەفیق حلمی-دا دەست پێدەکات. ئینجا هی دیکەی بەدوادا دێ وەک یاداشتەکانی ئەحمەد خواجە بەناوی (چیم دی) کە لە سێ بەرگدا چاپ کراون، بەگشتی لەم بیست ساڵەی دواییدا یاداشت تاڕادەیەک بەچڕی کەوتۆتە ناو ئەدەبیاتی کوردی. دەشێ وەک نموونەیەکی نوێی ئەم سەردەمە، یاداشتی (چێشتی مجێور)ی هەژار موکریانی، بەدەوڵەمەندترین و لەڕووی ئەدەبییەوە پوختەترین یاداشت دابنێین. هەڵبەت لە ڕووی زمان و دارشتنەوە.

**دژیەک** ANTINOMIE

ژان کۆهێن دەڵێ «شاعیر لە ئاسایی دەچێتە دەرەوە و جیاوازییەک یان نێوانێک دروست دەکات،» ئەمەش لە ڕێگای بەکارهێنانی هەندێ ڕوخساری دژبەیەک یان ناکۆک لە ئەنجامی لێک نزیک کردنەوەی هەندێ بیروبۆچوونی کەم تا زۆر پێچەوانە کە بەهۆی هاوواتا دژبەیەکەکان (= Antonyme) دەردەبڕدرێن.

بەم چەشنە ڕووبەڕوو یان لێکخشاندنێک لەگەڵ لۆژیک ڕوودەدات، کاریگەری یان ئەنجامێکی شیعریی دەبێ.

بەگوێرەی فۆنتانییێ Fontanier، دژیەک یان (طباق) «یەکێکە لە ڕوخسارە هەرە سەرنج ڕاکێشەکان.» بەهەمان شێوە دەتوانین بەئاسانی لەناو دژیەکە جۆراوجۆرەکان بیناسینەوەو شیتەڵی بکەین، چونکە پێچەوانە یان ناکۆکییەکان تێیاندا بەهۆی (مسند)ەوە ئاشکرا دەکرێت.

ناکۆکی یان دژایەتی-ی ئاشکرای یان دیاری، مفارەقە (=Paradoxe) هەوڵێکی فیکریی توندوتۆڵتری دەوێ وەک لە ناکۆکی یان دژیەکی ئاسایی دروست کردن، کە ئەمەی دووەمیان بەناکۆکی بیر (= Antilogie) ناسراوە. ڕووی هەڵەی ئەمەیان دیارە، بەڵام لە هی یەکەمیان ڕوخسارە ڕاستەقینەکەی شاراوەیە.

شـاعـيـري فـەرەنسی (کنۆ= Queneau) دەڵێ: «ئەو پیـاوە پیـرە گوێیەکانی خۆی دەگرت بۆ ئەوەی قسەی ئەو ڕووتەڵە نەبیسێ کە ئامادە نەبوو بەخۆی بڵێ (...)» دژیەک هێز و توانای شاعیر پێشان دەدات دەشێ ئەمـەش وەک «تاریک و ڕوون.» تەعـبیـری لێ بـکرێ یانیش بەم جـۆرەیە ڕوخسارەکان کە خۆیان پێشان دەدەن.

لێرەوە ئەم دژیەکە ئەمەندە بەهێز ڕووبەڕووی ڕێزمـانناسـەکان دەبێـتەوە سەرەنجام ئەمانەی دوایی بۆ بەرگریکردن لە خۆیان، ناویان لەمە ناوە (= Oxy moron)، واتە بەم جۆرە ناویان لە دژیەک ناوە.

ئەمەش لە زمانی یۆنانییەوە هاتووە کە بەم جۆرەیە: (Oxus دەکاتە تیژ، دژوار. Moros-یش واتە شـێت، پیـسکە.) سـەرەنجام Oxymoron لەلای یەکـێـکی وەک: Leon Cellier مـانای «بوونی نـاوەرۆکـێـکی شـاراوەو نهێنی... پیرۆز بەمانا ئایینییەکەی.» دەگەیەنێ.

لە جیهانێک کە هیچ شتێک تێیدا موستەحیل نییە، گا سەما دەکا و گـوێدرێژ شەشـتـار دەژەنێ. بێگومـان لێـرەش دژیەک هەسـتی پێـدەکرێ. ئەمەیان پێی دەوترێ (=Adynata یان Adunata،) کە مانای (بەرامبەر یەکـتـر دانانی ئەو شـتـانەن کـە لەگـەڵ یەکـتـری ناگـونجـێـن.) وەک ئەو نموونەیەی سەرەوە.

بێجگە لەمـەش لەنێـو ئەو شـیـعـرانەی کـە ناوەرۆکـیـان زیاتر دەربارەی خۆشەویستییە، بەتایبەتی لە شیعری سۆفی نموونەی لەم چەشنە، لە شێوەی (مفارەقە) و Oxymoron زۆرە. هەروەها لە شـیـعـری کـلاسیکیش دژیەک گەلێک زۆرە و، Adynata بەبەرزترین شێـوە لەلایەن ڤـیـرجـیل= Virgile بەکارهێنراوە.

بێگومـان دژیەک لە ئەدەبیـاتی کـوردی، بەهەمـوو چەشنەکـانی بەئاسـانی دەدۆزرێتەوە، نموونەشمان گەلێک زۆرە.

## راز یان داستانی گیانداران APOLOGUE

چیـــرۆکـــێک یان داســـتـــان یان ئەفـــســـانەیەکی بچکۆلەیە، بەڵام کەسایەتییەکان لە گیاندار و ڕووەک پێکدێت و لە شێوەی ئادەمیزاد دەدوێن و هەردەمیش ڕوخسارێکی ئەخلاقییان هەیە بۆ مرۆڤ. ئەم جۆرە نووسینە یان چیرۆکی لەم جۆرە کە ئێمە (ڕاز یان داستانی گیانداران)مان بۆ داناوە، لە مێژووی ئەدەبدا سەرچاوەکەی بزرەو دەکرێ بە(سەرەتاییترین جۆری ئەدەبی= Infera litterature) لە مێژووی ئەدەبی جیهانی دابنرێ. زۆربەی جار چیرۆکنووسەکانیان (ڕازنووس)ەکانیان بەبلیمەت لە قەڵەم دراون، وەک لافۆنتێن و (ئیزۆپ)ی یۆنانی.

ناسراوترین جۆری ئەدەبی لەم چەشنە لە ڕۆژئاوا، ئەو ڕازانەن کە بەهی ئیزۆپ ناسراون و یەکەمجار لە ئێون (یۆنان) لە سەدەی شەشەم کۆکراونەتەوەو دواتریش لە ڕۆما لەلایەن فیدر= Phedre کۆکراونەتەوە. لەسەردەمی بووژانەوەش گەلێک وەرگێڕ و نووسەر کاریان لەسەر ئەم ڕازانە کردووە. لە ڕۆژهەڵاتیش، چیرۆکی پانشاتانترا (= Panchatantra)ی سانسکریتی و چیرۆکی بەیدەبا یان بیدپا (= Bidpai)ی هیندی وەک سەرچاوەیەک ناسراون، لە وڵاتی فارس و عەرەبەکانیش کلیلە و دمنە هەمان ڕوخساری هەیە.

دەربارەی سەرچاوەی ئەم چیرۆکانە (ڕاز) کۆمەڵێک تێککردنەوە و ئاڵۆزی هەن. بۆ نموونە دەشێ سەرچاوەی ڕازەکانی ئیزۆپ لە ئارامییەوە هاتبێ، بەتایبەتی لە چیرۆکی یان (سەربردەی ئەهیقار)، هەرچی ڕازەکانی (لوقمان)ی ناو عەرەبەکانە دەشێ لە هی ئیزۆپەوە سەرچاوەی گرتبێ.

گۆران

بەگشتی، ڕازەکانی ڕۆژهەڵات، بریتین لە تێکستی زۆر کورت وەک زنجیر تێکدەکەنەوە ئەمەش وێڕای گێڕانەوە دەڕۆن و لە هەمان کات مانایەک دەبەخشن، وەک دەرسێکی ئەخلاقی بۆ سوودی گشتییە. هەرچی ئەمانەی ڕۆژئاوان، زیاتر ئەخلاقێکی فەردییان هەڵگرتووە، کورتن و لەگەڵ چیرۆکی دیکە تێکەڵ نابن و سەرەتا و کۆتاییان دیارە. ئەو دەرسە ئەخلاقییەی هەڵیان گرتووە بە«گیانی ڕاز»ە کە لە قەڵەم دەدرێت.

**ڕۆلان بارت** Roland BARTHES

ڕۆلان بارت، یەکێکە لەو نووسەر و ڕەخنەگرە فەرەنسییانەی لەبارەی گەلێک نووسەر و دیاردە و شت نووسین و لێکۆڵینەوەی هەیە، وەک: مارکیز دو ساد، بیتهۆڤن، ڕاسین، بیفتێک- فریت Bifteck- Frites:

**(جۆرە خواردنێکی میللییە) ستریپ - تیز Streep - Tease (خۆپێشاندانی ئیرۆتیکی) و Lied Allemand (جۆرە گۆرانییەکی میللی ئەڵمانییە) و برێشت Brecht.**

ڕۆلان بارت، زوو زوو مێتۆد (منهج)ی نووسین و بیرکردنەوەی خۆی گۆڕیوە. هەندێ جار مێتۆدی تێماتیکی (بابەت-Theme)ی گاستۆن باشلار-ی بەکارهێناوە، هەندێ جاری دیکە، بەسوود وەرگرتن لە فرۆید مێتۆدی دەروونناسی ئیتنۆلۆژی (Psychanalyse Ethnologique)ی بەکارهێناوە. یەکێ لە سەرچاوە سەرەکییەکانی بریتی بووە لە کتێبی تۆتەم و تابووی فرۆید. لە ڕووی ئیدیۆلۆژیش، لە سەرەتای ژیانی مارکسیستێکی زۆر توندڕەو بووە، ئەو سەردەمە کەوتبووە ژێر کاریگەری برێشت. پاشان وەک تاقە پاڵەوانی مەیدان بەرگری لە ئالان ڕۆب گرییێ و کۆمەڵەی ڕۆمانی نوێ و فۆرمالیزم کردووە. دواتر بەرەو جۆرێک لە جوانیناسی دەچێ و گرینگی بەخوێندنەوە و چەشە و لەززەتی ئەدەبی دەدا. ئەمەش لە چوارچێوەی ئەم مێتۆدانەی سەرەوە.

ڕۆلان بارت ساڵی ١٩١٥ لە شێربورگ لە فەرەنسا لە دایک بووە و زۆر

درەنگ دەستی بەنووسین و بڵاوکردنەوە کردووە. لە ساڵی ١٩٥٣ یەکەم کتێبی خۆی بڵاوکردۆتەوە. ڕاستەوخۆ لە زانکۆ کار ناکا، بەڵکو لە ڕێگای گرینگی کارەکانی ساڵی ١٩٦٢ دەکرێتە بەڕێوەبەری کۆلێژی پراتیک Ecole- Pratiques. ساڵی ١٩٦٧ وەک پرۆفیسۆرێک لە (کۆلێژی دو فرانس College De France) وەردەگیرێ. تاقە کورسی تەرخان کراو بۆ (سێمیۆلۆژی ئەدەبی- Semiologie Litteraire) داگیر دەکا. بارت، ماوەیەکی درێژ دوور لە هەموو ناوەندێکی کولتووری ژیاوە، ئەمەش زیاتر بەمەبەستی ئەوە بووە، بتوانێ بنچینەیەکی توندوتۆڵی ڕۆشنبیری و کولتووریێکی ڕەسەن بەرهەم بهێنی. هەر لەبەر ئەمە دەبینین، بارت لە بارەی گەلێک شت بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەی هەیە، وەک: سینەما، شانۆ، هونەری پلاستیکی و ئەدەب، مێژوو، دیاردە شارستانییەکانی ڕۆژئاوا... هتد. بارت، هیچ کاتێک بەدوای مۆد و مۆدێل نەکەوتووە، بەتایبەتی لە بەشی دووەمی ژیانی. لەم ڕووەوە لە (فوکۆ-Fouchault)ش زیاتر بەشداری لە دامەزراندنی مۆدێرنیتێ کردووە: لە هەڵگێڕ و وەرگێڕ و بێ ماناکردن و بەدواداچوون و دامەزراندن و شکاندنی بتەکان و دروست کردنەوەیان بەچەشنێکی دیکە، گۆڕینی بەها فیکری و ئەدەبی و شارستانییەکان دەستی هەبووە. دژی دووبارەکردنەوە و تێز و ئایدیۆلۆژیا و فێتیشیزم و دەسەڵاتی دیاردەکان و شتی موکتەسەب و حازربەدەست بووە، هەمیشە بەزیگزاگ-Zigzag بەرەو پێشەوە چووە و دەستی هەبووە لە گۆڕان و دروستکردنی ڕەسەنایەتی. ئەم مێتۆدەش بەئاشکرا لە کارەکانی و مێژووی بەرهەمەکان و فیکری بارت هەستی پێدەکرێ.

نووسەر لە کتێبی (ئەفسانەکان- Mythologies) گرینگی بەهەندێ دیاردەی کولتووری و شارستانی داوە کە وەک ئایدیۆلۆژیای بورژوازی بچووک خۆیان پیشان داوە، وەک: ڕووداوەکانی ڕۆژانە- Faits- Divers، وێنە- Photo، گوتاری ڕۆژنامەکان، بورجی ئێفێل- La Tour Effele، مانکا- Mannequin (ئەو کچانەی جلوبەرگ و مۆد پیشان دەدەن.)

(لێرە دەبێ ئاماژەی ئەوە بکرێ ئەم دیاردانە زیاتر پێوەندییان بەکولتووری ڕۆژئاواوە هەیە، لە ڕۆژهەڵات نموونەیان کەمە، بەڵام دەکرێ وەک لایەنی تیۆری سوودی لێ وەربگیرێ).

کتێبی (پلەی سفری نووسین) لەهەمان ڕیزی کتێبی پێشوو حسێبی بۆ دەکرێ. نووسەر مەبەستی سەرەکی لەم کتێبە بریتییە لە: (مێژووی ئاخاوتن یان شێوازی ئەدەبی یان زمان -Langage نە دەبێتە مێژوویەک بۆ ئاخاوتن یان شێوازی زمان، نە دەبێتە ستایل -Style، بەڵکو تەنیا مێژووی نیشانەکانی ئەدەبە).

لێرەوە، کارەکانی بارت ڕاستەوخۆ ڕەخنەیەک پێشکەش دەکەن کە بەڕەخنەی مانا ناسراوە. مانا- Signification نەک ناوەرۆک یان ناواخن. مانا نەک ئەو سیستەمە ئیجبارییەی لە پێوەندییەکان هەیە، بەڵکو وەک ئاخاوتن یان ئەو مانایەی مرۆڤ لەگەڵ خۆی یان لەگەڵ کەسانی دیکە هەیەتی. دەشێ بەنموونەیەک ئەمە باشتر شی بکرێتەوە، وەک: وشەیەکی وەک گڕ- Flamme، لە یەکێ لە شانۆگەرییەکانی ڕاسین مانای خۆشەویستی دەگەیەنێ. هەمان وشە وەک نیشانەیەکی Signe سادەیە بۆ ناسینەوەی جیهانی تراژیدی کلاسیکی، یان بیفتێک- فریت بۆ نموونە، دەشێ وەک سەمبۆلێکی تایبەت بەفەرەنسییەکان سەیر بکرێ. بەکورتی هەموو شتێکی ئاخاوتن، بێجگە لە پەیامی ڕاستەوخۆی خۆی، ئیشارەی خۆی- Dẹnotation، لە ڕووی پێوەندییەوە بەحەقیقەت دەنێرێ، دەشێ مانایەکی دیکەش: (مانای دووەم-Connotation) تا ئەو ڕادەیە وەربگرێ بۆ ئەوەی بچێتە ناو بواری مانا Signification، ناو بواری بەهاو نرخ، بۆیە لە ڕوانگەی بارت، هەموو شتێک دەشێ ببێتە نیشانە Signe و ئەفسانە Mythe.

ڕەنگە ئەو پرسیارە بکرێ، ڕەخنەی ئەفسانە، یان وردتر و ڕوونتر، ڕەخنەی نیشانە ئامێز Signe یان ڕەخنەی مانا ئامێز Signification بۆچی؟ چونکە بەپلەی یەکەم ئەم ڕەخنەیە گەندەخۆرە: فۆرمێکی بێ

ناوەرۆکی هەیە. ئاخاوتن یان شێواز دروست ناکا، بەڵکو دەیدزێ، بۆ مەبەستی خۆی گلی دەداتەوە، بۆ دروست کردنی مێتا ئاخاوتن یان مێتا شێواز یان مێتا زمان- Metalangage. بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ شتەکان بەقسە دێنێ. لە لایەکی دیکە، چونکە ئەم ڕەخنەیە: فێڵبازە و هێڵی دروست بوونی خۆی، مێژووی خۆی دەشارێتەوە، بەچەشنێکی نارەسەن بەڕوالەت سروشتی خۆی پێشان دەدا. ئایدیۆلۆژی بورژوازی ڕواڵەتێکی سروشتی دەداتێ، لە کاتێکدا زیاتر سیفەتی حازر بەدەست و فیکری باویان =Stereotype هەیە، وەک: ڕای گشتی، عەقڵییەتی زۆربە، ڕەزامەندی وردەبۆرژواز، توندوتیژی فیکری باو. خاڵی سێیەم لەم ڕەخنەیە ئەوەیە: زوو زۆر دەبێ، هی وەکو خۆی دروست دەکاتەوە: نیشانەیەکی گەلێک زۆری درێژدادڕ و هەڵاوساو نەخۆش هەن. هەندێ جار ئەم نیشانانە تا ڕادەی هێڵنجدان مرۆڤ ماندوو دەکەن و هێرشی بۆ دێنن. لەم ڕووەوە بارت دەڵێ: (ئێمە لە ڕۆژێکدا چەندان نیشانەی بێ ماناو چروک (Insignifiants) دەبینین. ڕەنگە زۆر نەبن، لێرەوە خەیاڵمان بۆ ئەو جیهانە توندوتیژە دەچێ کە لەناو ئارمەکان هەن بۆ نموونە، یان لەناو لافیتە و دروشمەکان یان ئەو مانایەی لە ڕیکلامەکان دەیاندۆزینەوە.

دوای بڵاوبوونەوەی کتێبی میتۆلۆژی، بارت دوورتر دەڕوا. هەوڵدەدا سێمیۆلۆژی (نیشانەناسی) وەک زانستێک دامەزرێنی، وەک، زانستێک لە ڕێگای ژیانی نیشانەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و شارستانی بکۆڵێتەوە. بەهەمان ئەو شێوەی ساڵی ١٩١٠ فێردیناند دو سۆسور لە کتێبی (وانەکانی زمانناسی گشتی) لە بواری زمان کردبووی. سۆسور لەگەڵ ئەوە بوو کە زمانناسی لەناو زانستێکی گشتی نیشانەکان بتوێنێتەوە. هەرچی بارت-ە تەواو بەپێچەوانەوە بیردەکاتەوە. بەلای ئەو مانا- Signification هەمیشە بەناو ئاخاوتن یان شێوازێک یان زمانێک دادەچێ، لەم ڕووەوە سێمیۆلۆژی (نیشانەناسی) تەنیا دەبێتە تایبەتمەند کردنی زمانناسی نەک بەرین کردنی. ئەو لەگەڵ ئەوەیە، نیشانەناسی تا

ئێستا تەنیا وەک کۆدێکی لابەلا بەکار هاتووە، وەک کۆدەکانی جادە، بەڵام کە لەم ئاستە تێدەپەڕین، لە بواری کۆمەڵایەتی قوول دەبینەوە، سەرلەنوێ تووشی ئاخاوتن و شێواز دەبینەوە.

بەم شێوە دەبینین، سیمیۆلۆژی بەسوودوەرگرتن لە زمانناسی تاڕادەیەک کێشەکە سادە و ڕوونتر دەبێ. ئەگەر بێت و لە زمانناسی مێتۆد و چەمکە هەرە دیارەکان وەرگرین، بەتایبەتی ئەوانەی زۆریان کار پێ دەکرێ وەک: زمان/وشە، مانادار/ مانالێکدراو (Signifiant / Signifie)، سینتاگم / پارادیگم (ترکیب تعبیری = Syntagme / سیستەمی گەردان کردن = Paradigme)، دەتوانین بەهەمان شێوە لە بواری ئەدەب و ئاخاوتنی ئەدەبی و سیستەمی کۆمەڵایەتی و سینەما و هونەرەکان و هەتا سیستەمی خواردن و مۆد و خۆپۆشین-یش بگەین.

بارت وێڕای کارکردن لە بواری نیشانەناسی- Semioiogie بەردەوام، بەشێوەیەکی گشتی گرینگیی بەئەدەبیات داوە. لەم ڕووەشەوە، خوێندنەوەکانی ئەو هەردەم هەڵگری تایبەتمەندییەکی جەوهەری بوونە و گفتۆگۆ و بەدواداچوونێکی زۆری هەڵگرتووە.

ئەم سەرەتای گرینگیدانە بەئەدەب، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٢، کە گوتارێکی ڕەخنەیی لە گۆڤارەکەی ئەندرێ ژید بڵاوکردۆتەوە، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکیش لەبارەی میشلێ- Michelet-ی مێژوونووس، بەناوی (میشلێ لە زمانی خۆی.) لەم لێکۆڵینەوە سەرەتاییانە، بارت، بەپێچەوانەی نووسینی لێکۆڵینەوەیەکی کلاسیکی و مێژوویی ئاسایی، خوێنەر بەرەو شیکردنەوەی زیندەخەون Revrie - و سەمبۆل و نەشئە -Eu-phorie-ی ئەدەبی و پێچەوانەکەی دەبا. بەڵام بەو گوتارەی کە لە بارەی ڕاسین- Racine-ی نووسی، بارت گفتوگۆ و کێشەیەکی ئاڵۆزی لە نێوان کۆن و نوێ، یان لە نێوان هەموو ئەو ناوەندەی خوێندنەوەیەکی شەرعی و ڕەسمی هەیە بۆ ئەدەب و ئەو ناوەندەی تەواو پێچەوانەی ئەمەی یەکەم بۆ ئەدەب دەڕوانێ. بێگومان ناوەندی یەکەم، ئەدەبی ناو دانیشگاکان و

تەواوی ئەو ڕەخنەگرانە دەگرێتەوە کە مێتۆد و کەرەستە ئەدەبییەکان بەچاوێکی دیکە، جگە لە خوێندنەوەیەکی مێژوویی و سروشتی و کلاسیکی ناڕوانن، بەکورتی ڕەخنەی نوێ و ڕەخنەی کۆن. نووسەرێکی وەک Raymond Picard، وەڵامی ئەم گوتارەی بارت دەداتەوە، بەڵام سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ. سەرەنجام بارت لە هەوڵی خۆی بۆ چەسپاندنی ڕەخنەی نوێ بەردەوام دەبێ. ئەمەش لە هەردوو کتێبەکەی - گوتارە ڕەخنەییەکان- Essais Critiques و گوتارە ڕەخنەییە نوێیەکان- Nouveaux essais critiques، بەردەوام دەبێ. گوتارە ڕەخنەییەکانی ئەم دوو کتێبە، بوونەتە بنچینەی ڕەخنەی نوێ، کە نووسەر تێیدا لە بارەی نووسەرە بەرچاوەکانی فەرەنسی لێکۆڵینەوەی پێشکەش کردووە، وەک: لا ڕۆشفوکۆ- La Rochefoucauld، برێشت، لابرویێر La Bruyere، ئالان رۆب گریێ، پییەر لۆتی، ژۆرژ باتای، ڤۆلتێر، پروست، فلۆبێر، کافکا... هتد. جیاوازی و لایەنی سەرنج ڕاکێشی بارت لە چاو ڕەخنەگرە ڕەسمی و کۆنەکانی، ئەوە بووە، بارت خۆی خەریک نەکردووە بەبەکارهێنان و پسپۆڕیی ئەکادیمیی زانستی، بەڵکو هەوڵی داوە بەو پەڕی ئازادی بنووسێ، یان وردتر، هەوڵی داوە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و ڕەخنەیی بەچەشنێک بنووسێ، هەروەکو چۆن شاعیرێک یان چیرۆکنووسێک تێکستێکی ئەدەبی دەنووسێ. بەکورتی، هەردەم ویستوویەتی، گوتاری ڕەخنەیی کە بەلای زۆربەی ڕەخنەگران بەئەدەبێکی پلە دوو دادەنرێ، ئەو بیهێنێتە ڕیزی ژانرەکانی دیکەی ئەدەب.

لە ڕوانگەی بارت، ئەدەبیات بەشێوەیەکی گشتی بەرینترین بواری نیشانەناسی-یە و پڕە لە مانای ڕێکخراو. بۆ نموونە: ڕێتۆریک - Rhet-orique چییە ئەگەر بریتی نەبێ لە تەواوی ئەو (دلالة اضافیة - Con-notaion) یانەی کە لاپەڕەیەکی نووسین، بێجگە لە مانا ڕاستەوخۆکەی بەخۆی دەڵێ (ئایا من لاپەڕەیەکی ئەدەبیم؟).

دواتر بارت لەگەڵ کتێبی: سەرەتایەک بۆ شیکردنەوەی بونیادی

چیـــــرۆک- Introduction a L'analyse des recits، هەوڵی ئەوە دەدا ئەدەب وەک سیـستـەمێـک لێکبـداتەوە. لێـرەش پرۆژەی S/Z کە تایبەتە بەمەسەلەی چیرۆک و هونەری گێڕانەوە، کە بەوەزیفەیەکی ئەسڵی دادەنێ، دەخاتە ڕوو. بەڵام بارت هەر زوو واز لەم هەوڵەی خۆی دێنێ. لێرەوە بەرەو گرینگیدان و خوێندنەوەی تێکست (دەق- Text) دەچێ. ئیـتـر لەمـەودوا ئەو گرینگییەی کە بە(نیشانە Sign-ی) دەدا هەمان گرینگی بەتێکست دەدا. کـتـێـبـی (لەززەتی تێکست- Le Plaisire du Texte) کـە لە کۆمەڵێک وردە تێکست و بیـرکردنەوە پێکهاتووە، هەوڵی ئەو ماوەیەی بارت-ەکە بەیەکێ لە سەرەنج ڕاکێـشـتـرین خـوێندنەوەی تیـۆریی ئەو دادەنرێ. لەم کتێبە بارت باسی تێکست دەکا نەک کاری ئەدەبی، کە وەک خـیـتـابێک و کـۆدی کـۆمـەڵایەتی لە دایک بووە، مـەسـەلەی خـزینی تێکستێک بۆ ناو یەکێکی دیکە- Intertextualite، وەک تێکەڵ بوون و بەیەکداچوونی دەنگەکان سەیر دەکا. ئەو دیالۆگیـزم-ەی تێـدایەتی وەک درەوشانەوە و کۆچکردنی مانا- کان حسێبیان بۆ دەکا. دڵنیایی لەسەر جۆراوجـۆری هاندەر و خـەسـتبـوونەوەکـانی ناوەوەی تـێکست دەکـا، ئەو تۆوەی- Grain، کـە لە تێکسـتـدا هەیە بەسـەرچاوە و مـاتۆڕی لەززەتی دادەنێ، لێـرەشـەوە تێکست حسـێـبێکی بۆ دەکـرێ، بەو مـانایەی وەک جیـهـانێک لە نێـوان نووسـەر و خـوێنەرە. لێـرەشـەوە بارت ڕۆڵـی خـوێنەر بەگرینگ دەزانێ، بەڵام نەک خوێنەری بێ جووڵە و بزاف- Passif، بەڵکو ئەو خوێنەرەی پشکنین و شیکردنەوە دەکا. چونکە هەردەم ئەو پێوەندییەی تێکست هەیەتی بەنووسەر و خوێنەر، هەردەم یەک لاییە، چونکە لە پشت تێکست نووسـەرێکی چالاک نابینرێ، یان لە بەرانبـەری خـوێنەرێکی بێ جـووڵە و ناچالاک. لە بەرانبـەر تێکست شت و بکەرەکـان ڕەش دەبنەوە، تێکست هەڵوێستـە گرامـەرییـەکـان کـە وەک پێـوەندی دەبینرێن، واتە لە نێوان شت و بکەرەکان لەناو دەبا.

لێرەوە تێدەگەین کە تێکست لە لای بارت بابەتی یان خۆراکی خیتابی

شاتۆبریان

زانستی و تیۆری نییه. (هەروەکو پێشتر بەم جۆرە سەیر دەکرا.) بەڵکو وەک ماتۆری ختابێکی مێتافۆری و مەوزووعی سەیر دەکرێ، بەکورتی وەک ماتۆڕی نووسین: بارت دەڵێ: «نووسین، نووسینی تێکستێک بەرزترین لووتکەیە کە تیۆریی تێکست دەیگاتێ.» لێرەشەوە دەبینین: لە ئەنجامی پراتیک کردنی نووسین- بارت لە (ڕۆشنبیرێک) بووە (نووسەر)ێک. لەمەش مەسەلەی بونیاد بەئاشکرا هەست پێدەکرێ.

**تێبینی:**

- S/Z گوتارێکی ڕەخنەیی بارتە، بنچینەی لە تەنیشت یەکتری دانانی ئەم دوو پیتە دەگەڕێتەوە بۆ دوو وشەی فەرەنسی کە لە نووسین تەنیا یەک (S) لێکیان جیا دەکاتەوە و مانایان دەگۆڕێ، یەکێک بە(Z) دەخوێندرێتەوە ئەوی دیکە بە(S). وەک: پواسۆن S–Poisson، پوازۆن–Z–Poison یەکەمیان بەمانای ماسی دێ، دووەمیان بەمانای ژەهر.
- Connotation، واتە مانای ڕاستەوخۆ و مانای شاراوە. هەندێ جار بەسێبەری مانای ڕاستەوخۆش لێکدەدرێتەوە.

**باختین** (١٨٩٥-١٩٧٥) M.M. BAKHTINE

میخایل میخایلۆڤیچ باختین لە Orel لە ڕووسیا لە خێزانێکی بەگزادەی کۆنی ڕووسی لە دایک بووە کە کۆمەڵێک کەسایەتی ناوداریان لە مێژوو و کولتووری ڕووسی لێ هەڵکەوتووە. باختین خوێندنی دواناوەندی لە ئامادەیی Odessa تەواو کردووە. ساڵی ١٩١٣ دەچێتە کۆلێژی مێژوو و فیلۆلۆژی زانکۆی Rossiisk Novo (ئەمڕۆ بەزانکۆی Odessa ناسراوە.)

پاشـان دەچێـتـە زانـکۆی سـان پێـتـرسـبـۆرگ (Saint-Petersbourg) بەڵام باختین بەتوانا و لێکۆڵینەوەی تاکە کەسی خۆی فەلسەفە و ئێستێتیک و فـیلۆلۆژی دەخـوێنێ و لـەم ڕێگایەوە ڕوانین و مـێـتـودەکـانی خـۆی بنیـات دەنێ.

باخـتین بەپلەی یەکـەم بەتیـۆربناس و مـێـژووناسی ئەدەب ناسـراوە. میـخـایل باختین هەندێ لە کـتـێبـەکـانی بەناوزناوی تایبەتی بڵاوکردۆتەوە. ئەمەش دواتر کێشـەیەکی ئاڵۆزی ناسـینەوەی بەرهەمەکـانی بۆ خوێنەران و ڕەخنەگران دروست کردووە. سەرەتای ناسـینەوە و ناووبانگی دەگەڕێتەوە بۆ سـاڵی **١٩٦٣** بەتایبـەتی کـە کـتـێـبی (گـرفـتـەکـانی شـیـعـرییـەتی دیسـتـۆیـۆڤـسکی) بڵاو دەبێـتـەوە کە پێـشـتـر لە ساڵی **١٩٢٩** بەڕووسی بڵاوبـووەوە و لـە سـاڵی ١٩٧٠ بەفـەرەنسی بڵاو دەبێـتـەوە و سـەرەنجی خـوێنەران و ڕەخنەگـران ڕادەکـێـشێ. بەتایبـەتی کـە ژولیـا کـریسـتـۆڤـا گـوتارێکی لە بارەیەوە نووسی بەناوی (شیعرییەتی دیستۆیۆڤسکی.) لەم کتێبە کە بەلێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانی باختین ناسراوە، نووسەر پایەیەکی ئەدەبی دیاری بۆ خۆی دروست کرد و بۆتە شوێنی سەرەنجی فۆرمالیستەکان و زمـانـنـاسـەکـان و ڕەخنەگـرەکـان. لەو سـەردەمە ڕەخنەگـرە جوانیناسـەکـانی ئەڵمـانی وەک: Wolfflin و Walzel و فـۆرمـالیـسـتـەکـان ڕایان وا بوو کە ئەدەب و هونەر بریتین لە جـەوهەری سـەربەخـۆ پێـوەندییـان بەجـیـهـانی دەرەوەی نووسەر و خوێنەرەوە نییە، لەگەڵ ئەوەبوون کە دروستکردنی یان بیناکـردنی کـاری ئەدەبی دەوەسـتـێـتـە سەر گـێـڕانەوە و گـرێ و ناواخن و پێـوەندییـان بەبەرهەمـە ئەدەبییـەکـانی دیکەوە. بەڵام باخـتین دژی ئەوەیە ئەدەب و هونەر تەنیا وەک مـاددە سـەیری بکرێ. لەلای باخـتین سێ شـتی سەرەکی هەن کە بریتین لە: (**شێواز و فۆرم و ناواخن**)، ئەمانەش لە کاری ئەدەبی و هونەری تووشی یەکـتـر دەبن و یەکـێک بەم کـارە هەڵدەسـتێ کـە نووسەر یان دانەرە بەگشـتی. باختین دەیەوێ بـەچاوێکی پڕ سـەیری ئەدەب و هونەر بکەین وەک مـۆدێلێکی تـەعـبـیـرکـردنی بێ وێنە. هەر بابەتێک

بگریت، مێـژوویێک و ئایدیۆلۆژییـەک و ئەندێشـەیەکی لەپاڵە. باختین لە یەکێ لە گوتارەکانی کە بەناوی دانەر و پاڵەوان-L'Auteur et le héro- بە تیـۆرێکی پێشنیـارکردووە، پاشان ئەم تیـۆرە لە ئەنجامی گەشەپێـدان دەبێتە بیری سەرەکی ڕووانینە ڕەخنەییەکانی کە بریتییە لە: داهێنەر (**یان دانەر- یان نووسەر**) و پاڵەوانەکـانی لە حـاڵەتی بەراوردن لە بەرامـبـەر شێـواز و زمـانن. بەم جـۆرە لە ڕۆمانەکـانی دیسـتـۆیێـڤسکی یەک دەنگ هەستی پێدەکرێ و دەبینرێ و خاوەن دەسـتـەڵاتە ئەویش پاڵەوانەکانە نەک نووسەر خۆی. چەند سالێـک دواتر ژان پۆل سارتر Jean Paule Sartre بێ ئەوەی ئاگـاداری تیـۆر و ڕووانینەکـانی باختین بێ بەهەمان شێـوە لەبارەی ڕۆمانەکانی فرانسـوا مۆریاک دەڵێ: ڕۆمـاننووس مـافی حوکم دانی نییـە، چونکە پێشـتـر بـاختین گـوتبـووی: نـووسـەر (یان دانەر) لە کـاری ئەدەبی (وەک ڕۆمان) تەنیا بەشداری کەرێکی دیالۆگ و گفتوگۆیە.

ماوەی دوای خوێندنەوەی دیستۆیێڤسکی، باختین گەشە بەڕووانینەکانی دەدا و لەسەر ئەو بیرە دەگیرسێتەوە و (مرۆڤ) وەک (تاک) سەیر ناکات، بەڵکو وەک (کۆ) کە هەمـیـشـە لە گۆڕاندایە و یەکـێک پشت بەوی دیکە دەبەسـتێ. لێـرەوە بەرەو خـوێندنەوەیەکی گـشت گـیـری دەچێ و بابەتە نوقـسـانەکـان دەخـاتە بەر لێکۆڵـینەوە و لەبارەی جۆیس و کـافکاو ئارتۆ و فۆکنر دەنووسێ. دەتـوانین بلێین سێ سەردەم لە ژیانی ئەدەبی باختین هەن؛ ئەمـانەش بریتین لە: سـەردەمی سـۆسـیـۆلۆژی و مـارکـسـیـست، سـەردەمی زماننـاسی و سەردەمی مێژوو و ئەدەب.

لە سـەردەمی: سـۆسـیـۆ - مـارکـسـیـست دوو کـتـێـبی لەژێر ناوی (V.N.Volochinov) بڵاوکرۆتەوە: ١- مـارکـسیـزم و فـەلسـەفەی شێـواز یان زمـان. لە سـاڵی ١٩٢٩ چاپ کـراوە. فـرۆیدیزم کـە لە سـاڵی ١٩٢٧ چاپ کـراوە. بەپێی تیـۆرییەکەی سەرەوە لەلایەن ئەو (کۆ)یە نووسراوە کە باخـتین خـۆیەتی. لەم دوو کـتـێـبـەدا بـاخـتین زیاتر پەنجـە دەخـاتە سـەر سـۆسـیـۆلۆژی زمـان و بیـر وەک لەوەی سـایکۆلۆژی و زمـانناسـیـیـەکی

مەوزوعی دروست بکرێ، چونکە ئەو شتانەی مرۆڤ دروست دەکەن لە ناوەوە مەوزوعین یان لە خۆیاندا مەوزوعین. مرۆڤ لە لای باختین تەنیا لە لایەن ئەوی دیکە دەبینرێ. ئەم ئەوی دیکەیەش لەلای ئەو بریتییە لە (Exotopie)، واتە بوونێکی بالاّ و مەزن، ئەمەش بۆ خۆی (خودا) دەگرێتەوە. ئەمەش وەک ئەو پەیوەندییە دیالێکتیکیەی هیگڵ-ە کە لە نێوان من و ئەوی دیکە هەیە. لە هەمان کات پێوەندی بەناوەرۆکی ئایینی کریستیانیشەوە هەیە، چونکە باختین زۆر ئیماندار بوو. لەسالاّنی سی دژی زمانناسی بونیادگەری و شیعرییەتی فۆرمالیستەکان دەوەستێ و زمان (شێواز) وەک (کردەیەکی ناوەکی Intearction) نێوان دوو کەس دەبینێ نەک وە ک کۆدێک. نووسینەکانی ئەم سەردەمە لە کتێبەکانی (شیعرییەتی دیستۆیۆڤسکی) و (ئیستێتیک و تیۆری ڕۆمان) دەدۆزرێتەوە.

هەرچی لە سەردەمی مێژوو و ئەدەبە، باختین گرینگی بەگۆتە (Goethe)و ڕابلێ-(Rablais) داوە. ئەو گوتارەی لە بارەی گۆتە-ەوە نووسیویەتی بزربووە. گوتارەکەی دیکە کە ناووبانگێکی زۆری هەیە بەناوی (فرانسوا ڕابلێ و کولتووری میللی لە سەردەمی بووژانەوە)یە. لەم گوتارە باختین گرینگی بەکولتووری میللی داوە و بەتایبەتیش کەرنەڤالە میللییەکانی ئەو سەردەمە. بەلاّم باختین بۆ گرینگی بەکەرنەڤالە میللییەکان داوە؟ لێرەوە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو مەسەلەی (کۆ)یەی سەرەوە. ژولیا کریستۆڤا لەم بارەیەوە دەڵێ: ڕەنگە لەبەر ئەوەبێ کەرنەڤال بریتییە لە نمایشێک بێ شانۆ، هەروەها بێ نمایش خۆشی، بێ پێشکەش کردن و بێ نووسەر (دانەر) و بێ بینەر. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بێ کەرنەڤال ژیان و شانۆی تێدا بووە.

**چامە** BALLADE

زاراوەی بالاد مێژوویێکی کۆنی هەیە لە زمانە هیندوئۆروپییەکان. مانا هەرە کۆنەکەی بریتییە لەو گۆرانییەی وێڕای سەما دەوترێ. مانای دواتری بریتییە لە هۆنراوەی بچکۆڵە کە لە سێ کۆپلە، یان زیاتر پێک بێ. مانای دواتری بریتییە لە شیعرێکی (قەسیدە = چامە) کە ناواخنێکی ئاسایی، یان ئەفسانەیی و سەرەنج ڕاکێشی هەبێ. بالاد بەمانای پێشەکی مۆسیقایش دێ لە شێوەی (مقام) یان (موشح) کە پێش ڕیتمێکی دیکەی جیاواز (وەک بەستە) دەوترێ.

لە ڕووی ئیتیمۆلۆژی لە زمانە لاتینییەکان، لە سەرەتادا وەک -BAL LADA - بالادا هاتووە، زیاتریش بنچینەیەکی (دێهاتی، یان میللی = Provencal)ی هەیە. بریتییە لە هۆنراوەیەکی لیریکی و بونیادێکی جێگیری هەیە. ئەدەبیاتی کۆنی ئەورووپی، وێڕای مۆسیقا دەخوێندرایەوە، بەڵام دەتوانین بڵێین لە سەدەی حەڤدەمەوە بالاد لەگەڵ مۆسیقا و سەما ناوترێ. لەناو ئەدەبیاتی کوردی گەلێک چامە هەن ڕوخسار و ئەدگاری بالاد-یان هەیە، ڕەنگە (شێرکۆ بێکەس) تاقە شاعیرێکی کورد بێ لەم ڕووەوە زۆر سەرکەوتووبێ.

**بارۆک** Baroque

زاراوەی بارۆک لە ڕووی فەرهەنگی و ئەدەبی وەک هەمان زاراوەی ڕابردوو مێژوویێکی کۆنی هەیە. لە سەرەتای سەدەی شازدەمەوە لە زمانە ئۆروپییەکان بەمانای (نارێک) بەکار دەهات، وەک پارچە ئەڵماسێکی نارێک، یان گەوهەرێکی نارێک و خوار و خێچ. واتە، نارێک، سەیر، عەنتیکە، بێگانە، سەرەنج ڕاکێش. هەر لەو سەردەمەوە بۆ سەرەوەتر وەک بیرێکی موجەڕەدیش بەکارهاتووە، وەک: ئەم کوڕە چەند لاف و گەزافی هەیە، واتە کوڕێکی بارۆکە - نارێکە. پاشان لە سەردەمی بووژانەوە، بەتایبەتی لە سەدەی شازدەم و حەڤدەم و هەژدەمەوە، لە ئیتاڵیا، وەک

برۆتۆن

شـــێـــوازێکی هونەری لە بیناســـازی دەردەکـــەوێ. هونەرمـــەندە بیناســـازەکـــان ئازادییـــەکی تەواویان دەدا خـــەیاڵیـــان لە دروست کـــــــردن و ڕازاندنـــەوەی بیـــناو باڵاخـــانەکـــان و بەفـــۆرمی جـــۆراوجـــۆر دەیانڕازاندەوە. لەوساوە، وەکو شێـوازێکی هـونـەری بـەنـاو تـەواوی وڵاتـانـی لاتـین بڵاودەبێـــتـەوە. پاشـــان لە پەیکەرتاشی و هونەری نیگارکێشی ڕەنگدەداتەوە. لێرەوە کـــە دەوترا ئەم هونەرمـــــەندە، یان هەر هونەرمـــەندێک بارۆکـــە، یان شـــێـــوازێکی بارۆکی هەیە، بەو مـانایە دەهات کـە پێـچـەوانەی کـلاسـیکە، یان ئەو هونەرمەندە شێوازی کلاسیکی نییە. واتە بەپێچەوانەی کلاسیزم -Clas sisme بەکاردەهات. لە ئەدەبی فەرەنسی بارۆک وەک شێوازێکی هونەری و ئەدەبی لە ســەردەمی هێنری چوارەم و لویسی ســێــزدەم ســوودی لێ وەرگیـراوە. واتە بەدرێژایی سەدەی حەڤدەم. بەو هونەر و ئەدەبە دەوترا کە پابەندی پێوەرە ئەدەبییەکانی کلاسیزم نەبووە. بارۆک وەک زاراوەی ئەدەبی بەگشتی بەمانای پێچەوانەی ئاسایی و کلاسیزم دێ، بەڵام بارۆک، وەک جیـهـانبینیـیـەکی ئەدەبی و ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەی ئاڵۆز و قـووڵ، یان بەکـورتی وەک شـێـوازێک: Langage، یان زمـانێکی ئەدەبی، دەتوانین بڵـێین دەگـەڕێتەوە بۆ ناوەڕاسـتی سەدەی نۆزدەم. ئەمەش وەک شـۆڕشـێک بوو دژی کـلاسـیـزم و ڕۆمـانتـیزم. لەگەڵ گـەلێک کاری ئەدەبی ڕۆژئاوایی بەگشـتی و فـەرەنسی بەتایبـەتی، وەک نیگایەکی ڕەخنەگرانە، وەک جۆرە ئەدەبێک کـە بەجیـهـانـبینیـیـەکی تایبـەتی بنووسـرێ، لە سـەدەی بیسـتـەم بەبارۆکـیـزم Baroquisme ناسـراوە. وەک شـاعـیـرانی بارۆکی فـەرەنسی ساڵانی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردوو.

## مەقالە ESSAI

لە ڕووی ناولێنانەوە هەر لە کۆنەوە لە سەرەتای سەدەی ڕابردوو، لەگەڵ گەشەسەندن و فراوان بوونی جۆرەکانی ئەدەب لەناو ئەدەبیاتی کوردیدا، بەرامبەر بەم جۆرە نووسینە وشەی مەقالە بەکارهاتووە، بەڵام نزیکەی بیست ساڵێکە، بەڵکو زیاتریش، لەگەڵ نەمانی نەریتە ئەدەبی و ڕەخنەییەکان، یان کزبوونی و وەرگرتنی ڕێچکەیەکی دیکە، ئەم زاراوە ئۆرگیناڵە کەم بەکاردێ، لەکاتێکدا ئێستاش، دوای مێژوویەکی پێنج سەد ساڵەی ئەدەبیاتی زمانە زیندووەکان (= ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەڵمانی...) بەهەمان ئاستی شیعر وەک جۆرێکی نووسین بەکاردێ. ئیمڕۆ لە زمانی کوردی هەندێ زاراوەی دیکە وەک هاوتایەک بەکاردێ وەک: گوتار، وتار... هتد.

دەشێ ئەمانە ناولێنانی گونجاو بن، بەڵام بەدڵنیاییەوە مانای پڕاوپڕ ناگەیەنن، چونکە هەر ئەمڕۆ ئەم ناولێنانە، بەرامبەر بەزاراوەی ڕەخنەیی و جۆری نووسینی دیکەش بەکاردێ وەک: خیتاب- Discours، لەبەر ئەوە، لەو بڕوایەدانیم، گوتار بەرامبەر Essai- المقالە- گونجاو و پڕاوپڕبێ.

لە ڕوانگەی منەوە، پاراستنی (مەقالە) بەو شێوە و نەریتە ئەدەبییەی هاتۆتە ناو زمانی کوردی گونجاوتر و لەبارترە، چونکە لە زمانە زیندووەکانیش ئەم جیاوازی کردنە هەستی پێدەکرێ وەک: Discours= گوتار، Essai= مەقالە.

لە ڕووی ڕەخنەییەوە، تێرمی مەقالە سەرەنجمان بۆ چەشنە نووسینێک ڕادەکێشێ کە بەپەخشان دەنووسرێ، ئەمەش تاڕادەیەکی زۆر جۆراوجۆرە و لە چوارچێوەیەکی ئازادیدا خۆی نیشان دەدا، بەو مانایەی دەست نیشان کردنی پێوەر و ڕێنماو ڕێسایەکانی سەختە و دەوەستێتە سەر هەڵوێست و ڕوانینی فیکری و خەیاڵی نووسەر. مەقالە ئیشارەیە بۆ کۆمەڵێک تێکستی فۆرمی جۆراوجۆر کە بەستیلی جۆراوجۆر دەنووسرێ.

ئێمە لەناو ئەدەبیاتی کوردی بەتایبەتی و ڕۆشنبیری کوردی بەگشتی ڕەنگە هەندێ مەقالە نووسی ناسراومان هەبێ کە چەند کەسانێکی کەم دەگرێتەوە، وەک بۆ نموونە: مەسعوود محەمەد، یان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم چەندانێکی بەتوانا و ناسراو هەبوون، ئیمڕۆ، کەمتر هەست بەمەقالە نووسی ناسراو دەکرێ، ڕەنگە هەر نەبێ، هەڵبەت، لە چوارچێوەی ئەو ڕێسا تیۆرییەی ئێمە لە مەقالە نووسی دەبینین، بەو مانایەی بتوانێ، جیهانێکی موتەکامیل لە حوجەت و بورهان لە چوارچێوەی ستیلێکی هونەری پێشکەش بکا. (بێگومان وەکو تر ڕۆژانە دەیان مەقالە لە بڵاوکراوەکان دەبینین، بەڵام هیچ کامێکیان ئەم هەڵکەوتەی سەرەوەی لێ بەدی ناکرێ. لە ئەدەبی فەرەنسی بەتایبەتی و ئەدەبی ڕۆژئاوا بەگشتی، مۆنتێن- Montaigne بەباوکی هونەری و تیۆری ئەم جۆرە نووسینە لە قەڵەم دەدرێ. مۆنتێن لە سەدەی شانزەم ژیاوە و خاوەنی شاکارێکی سێ بەرگییە بەناوی (مەقالە ڕەخنەییەکان= Essais Critiques) یان هەندێ جار هەر بە(مەقالەکان- Essais) ناوی دەهێنن و بڵاوی دەکەنەوە. بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٥٨٨دا بڵاوبۆتەوە مۆنتێن دژی درێژدادڕی و ڕزاندنەوەی شێوازی نووسینە، بەڕای ئەو، ئەم خاڵە یەکێکە لە خاسییەتە هەرە سەرەکییەکانی هونەری مەقالە، ئەمە وادەکا نووسەر بەرەو پوختەیی بچێ و زیاتر خۆی بناسێ، لەلایەکی دیکە بەڕای مۆنتێن، نووسەر کە باش نانووسێ هەڵەو پەڵەکانی خۆی دەگەیەنێتە خوێنەر، خوێنەریش دەکاتە بەشێک لە پرۆژە خراپەکانی خۆی، بەڵام ئەگەر نووسەر بەپێچەوانەوە بێ، وا لە خوێنەر دەکا ڕەسەنایەتی تاکەکەسی و تایبەت بەخۆی لەلای خوێنەر پێشان بداو سەرەنجام ئەویش دەبێتە بەشێک لە داهێنانەکە.

فرانسی باکۆن کە باسی مەقالە دەکا، وەک ژانرێکی ئەدەبی سەربەخۆ لێکی دەداتەوە و لەم ڕووەوە دەگەڕێتەوە بۆ کارەکانی مۆنتێن.

لەناو ئەدەبیاتی ئینگلیزیش مەقالە بوونێکی بەربڵاوی هەیە و وەک

ژانرێک سەیری دەکرێ، ئەمەش لە Cornwallis- کۆرنوالیس تا هازلیت- Hazlitt.

سەرەنجام مەقالە، زیاتر لە ژانرێکی ئەدەبی، توانای مرۆڤ پێشان دەدا لە چوارچێوەی شێوازێکی نووسین و فۆرمێکی نووسیندا.

**وەسف** Discription

وەسف وەک ئامێرێکی (ڕوخسارێک) ئەدەبی لە ڕۆشنبیری و ئەدەبی ڕۆژئاواوە بەردەوام، لە ستەندال-ەوە تا ئەلبێرکامو بابەتی لێکۆڵینەوە و گفتوگۆی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بووە، چونکە وەک زاراوەیەکی ئەدەبی و ڕەخنەیی هەردەم جۆرێک تەمومژی هەڵگرتووە و کێشەیەکی ئەدەبی و ڕەخنەیی زۆری دروست کردووە.

بەهەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین بەپێچەوانەوە، لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵات، سەرەڕای بوونێ بەشێوەیەکی بەرچاو، کەمتر وەک تێرمیکی ئەدەبی و ڕەخنەیی سەرەنجی دراوەتێ، یاخود کەرستەیەکی تیۆریی کەمی هەیە.

لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا وەک ڕوخسارێک یان ئامێرێکی ئاخاوتن و خیتاب وەرگیراوە نەک وەک بابەتێک قووڵایی و ناوەوەی ئەدەب داگیر بکا. مەبەست لە وەسف ڕەنگ کردنی خیتابی ئەدەبییە دڵگیر بکەوێتەوە لای خوێنەر.

وەک لایەنی نێگەتیف و پۆزەتیف ڕوانینێکی زۆر لەبارەی وەسفەوە هەیە. پۆل ڤالێری- P. Valery- دەڵێ: وەسف وەک خۆراکێکی ئەدەبی دەبینم کە بەکیلۆ بفرۆشرێ. ئەم ڕوانینە بەپلەی یەکەم مەسەلەی زۆری و بۆری و سەرنەکەوتنی هەندێ لە نووسەران پێشان دەدا کە ڕوانگەیەکی ئابووریان نەبێ لە بەکارهێنانی وەسف و سەر بەنهێنییەکانی نووسین نەبن. ئەندرێ برۆتۆن، بەم چەشنە لە مانیفێستی سوریالیزم باسی وەسف دەکا: «وەسف وەک لە تەنیشت یەکتر دانانی وێنەی ناو کەتەلۆگەکانە، نووسەر بەئارەزووی خۆی بەکاریان دەهێنێ، فرسەتێک دەقۆزێتەوە

وێنەیەکم وەک کارت پۆستال (معایدە) دەداتێ و بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ منیش (منی خوێنەر) هەمان ڕوانینی ئەوم هەبێ لە بارەی وێنەکە.»

بێگومان ڕوانین و ڕەخنەیەکی لەم جۆرە لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا شتێکی تازە نییە. شارل پێرۆ- C. Perault- لە ١٦٩٠ز. لە کتێبی: کۆن و نوێیەکان لە بەرامبەر یەک، ڕەفزی ئەو وەسفە درێژدادڕییەی دیالۆگی ئەفلاتوون (Platon) دەکا.

نووسەرێکی دیکە بەناوی بێراردیێ دو باتۆ- Berardier de bataut، لە کتێبەکەی: لە بارەی گێڕانەوە-وە ١٧٧٦ز، لەگەڵ ئەوەدایە: وەسف دەبێ تایبەت بێ بەو بابەتەی لە بارەیەوە دەنووسین، ئیتر ئەو بابەتە شوێنێک یان ڕەشەبایەک یان دیمەنێک بێ، دەبێ بەچەشنێک بێ بگونجێنرێ و هەقی خۆی بدرێتێ. لە لایەکی دیکە، مارمۆنتێل- Marmontel- لە کتێبی: پێکهاتەکانی ئەدەب ١٧٨٧ز. هێرش دەکاتە سەر شیعری وەسفی و دەڵێ: ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ شیعری وەسفی، لەلای کۆنەکان شتێکی ناسراو نەبووە، بەڵکو ئەمە داهێنانێکی نوێیە و نە ئەقڵ نە چەشە وەری ناگرێ.

وەسف لە بنچینەدا دەگەڕێتەوە بۆ ژانری- Epidictique- کە باشترین مانا لێکدانەوەی ئەم وشەیە هەر وەسفە، بەڵام ئەمەیان وەسفێکە پێوەندیی بەڕوانینی دەربڕینە کە سەرزەنش و ستایش-یش دەگرێتەوە کە لە بواری ڕەوانبێژی- Rethorique- یان وردتر هونەرەکانی شیعر گرینگیی پێ دەدرێ. وەسف- Discription-، دەشێ کەرستەکانی حەقیقی و خەیاڵی بێ، فۆنتانییێ- Fontanier-، لە یەکێ لە لێکۆڵینەوەکانی لەگەڵ ئەوەدایە کۆمەڵێک جۆری وەسفمان هەیە، وەک:

وەسفی شوێن لە دۆخی سروشتی= Topographie-، وەسفی ڕووداو= Chronographie، وەسفی جووڵەی ڕوخسار وەک تەعبیرێک لە دەروون= Prosopographie، وەسفی نەریت و ئەخلاق= Ethopee،... هتد. هەروەها لەگەڵ ئەوەدایە دەشێ وەسف لە بارەی بوارێکی فیزیکی یان ئەخلاقی-

یەوە بێ، دەشێ هەردووکیان تێکەڵاو بکرێن.

لەلای فۆنتانییێ و هەروەها لەلای گەلێ لە نووسەرانی دیکە، وەسف: واتە پێشاندانی شتێک و ناسینی بەشێوەیەکی ورد بەچەشنێک سەرەنجم ڕاکێشێ.

کاتێ کە وەسفی شتێک دەکرێ، بەشێوەیەکی زیندوو و پڕ لە وزە، سەرەنجام وێنەیەکی خەیاڵیی سەرنج ڕاکێش دروست دەبێ یان تابلۆیەک دروست دەبێ. لێرەوە مەسەلەیەک دەورووژێ پێی دەگوترێ: Hypotypose = واتە وەسفی کاریگەر.

مارمۆنتێل دەڵێ: ئەگەر وەسف کەرستەکەی خۆی نایاب پێشان نەدا، نە سیفەتی شیعری وەردەگرێ نە خیتابی. (...) نووسەری بەتوانا دەتوانێ تابلۆی زیندوو دروست بکا.

لێرەوە هەوڵ دەدەین نموونەیەک لە ئەدەبی ڕۆژئاوا بهێنینەوە کە وەک بنچینەی گەشەسەندن و سەرهەڵدانی وەسف حسێبی بۆ دەکرێ و لەم ڕووەوە ماددەیەکی زۆری تیۆری هەیە. لە کتێبی (Locus Amoenus) کە لەلایەن لیبانیوس- Libanuis- کۆدو ڕەمزی بۆ دانراوە، لە بارەی وەسفی دیمەن-ەوە شەش پێکهاتووی گرینگ هەن خراونە ڕوو کە ئەمانەن: کانی یان سەرچاوە، دارودرەخت، باخچە یان ڕەز، کزەبا، گوڵ و خوێندنی باڵندە. دواتر حەفتەمیشی بۆ زیاد کراوە کە بریتییە لە میوە. بەگوێرەی سەرەوە دەبێ لە دیمەنێکی نایاب هەموو ئەم شتانە هەبن. ئەمانەش بەگوێرەی: هەر پێنج هەستەکانی مرۆڤ و هەر چوار توخمی گەردوونی (خۆڵ و ئاو و ئاگر و با.) و هەر چوار وەرزی ساڵ دەگۆڕێن. لە سەدەی هەژدەم ئەم هەموو وردەکارییە خاسییەتی شیعری وەسفی پێکدەهێنا و پاشان لەگەڵ تیۆریی- Sublime = هەستی مەزنی- و سەردەمی ڕۆمانتیک گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ڕوسۆ- J.J. Rousseau- لە کتێبی: ئیعتیرافات، بەم چەشنەی خوارەوە، دیمەنێک دەنرخێنێ کە ئەو کاتە بەچەشنە و ڕوانینێکی نوێ لە

قەڵەم دراوە: «دەمێکە دەزانم مەبەست لە وڵاتێکی خۆش و جوان چییە. قـەت وڵاتێکی پڕ لە دەشت ئەوها نەهاتۆتە بەرچاوم. وڵاتی جـوان لە ڕوانگەی من دەبێ، هەورە تریشـقـەی زۆربێ، تاوێر و گـابەردی گـەورەی هەبێ، پڕبێ لە سنۆبەر، دارسـتـانی ڕەش، چیـا، ڕێگای پڕ لە هەوراز و نشـێو، دۆڵی قـووڵ لە بن پێم بێ و ترسم بێنێـتێ.» بەم شێـوەیە وەسف گەشە سەندنێکی ئاڵۆز و بەرچاوی بەخۆیەوە دەبینێ و لە سەرەتای سەدەی بیستەم دەگاتە ئاستی گرینگی گێڕانەوە = Narration.

لە سەدەی هەژدەم بەکاریگەریی شاعیرانی ئینگلیزی وەک: تۆمسۆن- Thompson- و گرای -Gray-، وۆردزوۆرث- Wordsworth-، شیعری وەسفی گەشە دەکا، بەڵام لە سەدەی نۆزدەم کۆتایی پێ دێ، تاڕادەیەکی زۆر هەمان کێشە دووچاری ڕۆمانیش دەبێتەوە، بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم و لە ڕۆمانەکانی ئێمیل زۆلا- Zola زیاتر دەردەکەوێ. لەم سەردەمە، ڕەخنەگرەکان ئەم جۆرە ئەدەبەیان بەدڵ نەبووە و یەکێکی وەک مـارمـۆنتـێل دەمـێک بوو دەیگوت وەسف یان وەسـفی درێژ، زیاتر بۆ سەفەرنامە دەشێ وەک لە ڕۆمان.

زۆر کەم لە نووسەران خۆیان خستـۆتە ناو وەسفی درێژ، لەگەڵ ئەمەش لەلای ئیـدگـارپۆ- E. Poe - و ژولیـەن گـراک- J. Gracq، هەسـتی پێدەکرێ. ئەمانەش مەبەستی خۆیان لەپاڵ ئەم وەسفە درێژە هەبووە.

بەڵام گەشەسەندنی وەسف وەک تەندانسێک دەشێ لەگەڵ گوتارەکەی پیـێـر لاروس- P. Larousse- کـە بەناوی (وەسف)ە زیاتر دەربکەوێ. لاروس دەڵێ: «بەگوێرەی شیعرییەتی هەندێ شاعیرانی هاوچەرخ، وەسف بریتییە لە وێنەیەکی کۆپی کراو، یان فۆتۆگرافی ئەو شتەی دەینووسین.» ئەم وەسفەش جیاوازە لەگەڵ وەسفی تەعبیری کە لە لایەن کۆن و نوێیەکان هەیە. لەم ڕوانگەیەوە: «وەسفی ئەدەبی بەهیچ شێوەیەک سروشتی ڕازاوە نییە، بەڵکو بریتییە لە بینینی سروشت بەگیانێکی تایبەتی، بەهەست و دەروونێکی تایبەتی، لێرەوە سروشت بەشێوەیەکی پڕ کۆپی کراوە و هەموو

شتێک دەکەوێتە بەر ئەو چرکەیەی کە شاعیر بەهەست و ئاگاییەکی تایبەت بینیویە و وەسفی دەرەوەی کردووە.»

لەلای ڕەخنەگرانی سەدەی نۆزدەم خەوشی سەرەکی وەسف لەوەدا کۆدەبۆوە کە سیستەمێک و سنوورێکی دیاری کراوی نییە و هەموو شتێک دەکەوێتە بەر ڕوانینی نووسەر. لەم بارەیەوە پۆل ڤالێری ڕای وایە دەشێ ئێمە بەبیست لاپەڕە وەسفی شەپقەیەک بکەین و بەدە دێریش وەسفی جەنگێک بکەین. هەڵبەت کێشە ڕەخنەییەکە و ئاڵۆزییەکە لێرەوە دەردەکەوێ، کە دەشێ بەشێوەیەکی بێ سنوور وەسفی شتێک بکرێ.

**گۆرانی لیریکی** Chanson daube

«... دوو عاشق کە ژوانیان تەنیا لە شەودا ڕێک دەکەوێ ئاه و حەسرەت بەنزیک بوونەوەی ڕۆژ هەڵدەڕێژن و یەکتر بینینیان کۆتایی پێ دێت...»

ئەمەیە ناوەرۆکی گشتی ئەم جۆرە شیعرە کە زیاتر بەشیعری غەزەلی دەچێت، بەگشتی دەشێ بەشیعری تایبەت بەجیهانی خۆشەویستی لە قەڵەم بدەین، بەڵام هەندێ جاریش دیاردەی وەک سوارچاکیشی تێدەکەوێ، هەڵبەت، دەزانین لە داستانە نووسراوەکان و داستان و بەیتە فۆلکلۆرییەکانیش کە تێیاندا خۆشەویستی تێمی (بابەت)ی سەرەکییە، سوارچاکیش وەک هێڵێک تەریب بەوەوە، بەیەکەوە گەشە دەکەن و دەڕۆن.

گۆرانی لیریکی لە ئەدەبی ڕۆژئاوا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست کە لەلایەن شایەرەکان گوتراوە، ئەمەش بەگوێرەی وڵاتانی ڕۆژئاوا هەندێ جیاوازی و تایبەتمەندی هەیە. لە فەرەنسای کۆن بە(Alba) و (Aube) ناسراوە، لە ئەڵمانیا و وڵاتانی باکوور، وشەی وەک (Tegelied) بەکاردێت کە لەلایەن (Minnesanger)ەکانەوە بۆی دانراوە. کۆنترین گۆرانی لیریکی فەرەنسی بۆ سەدەی دوازدە دەگەڕێتەوە کە ناوی (Chrestomathie de Bartsch)ە و یەک تاقە دەستنووسی هەیە و پارێزراوە. تێمی سەرەکی ئەوسای گۆرانی لیریکی بریتی بووە لە گۆرانی

پازۆلینی

ژنێکی عاشق بۆ نادیاری دۆستەکەی (یان دەزگیرانەکەی)، تێیدا نەفرەت نەک هەر لە ڕۆژ دەکات، بەڵکو نەفرەت لە شەویش دەکات کە لەو کەسە دوور دەکەوێتەوە و دۆستەکەی ناپارێزێ کە خۆشی دەوێت. سەرەتا تەنیا بەگۆرانی ژنان ناسراوبوو، شایەرە ژنەکان. لێرەشدا بابەتەکانیان هەمەجۆر بووەو تایبەت نەبووە بەم دیاردەی سەرەوە، دواتر گۆرانی تێکەوتووە و ئەم چوارچێوەی وەرگرتووە و بابەتەکەشی لەسەر بیرۆکەیەکی چەسپاو یان دیار گیرساوەتەوە. ئەمەش بریتیی بووە لە حەسرەت و ئاه هەڵڕشتنی دوو عاشق کە لێک جودا بوونەوەیان بەهۆی هەندێ بەربەست و دیاردەوە نزیک دەبێتەوە.

ئەم بابەتە لە گشت ئەدەبی جیهانیدا هەیە، ئەمەش لەسەر ئاستێکی نووسراو و میللییدا. هەندێ جار گفتوگۆی نێوان دوو عاشقیش دەبێتە بابەتی گۆرانی لیریکی. ناسراوترین نموونەی لەم جۆرە، گفتوگۆی عاشقانەی (ڕۆمیۆ و ژولێت)ی داستانەکەی شکسپیر-ە کە هەر بەم ناوە ناسراوە. دەشێ شکسپیر سوودی لەم نەریتە ئەدەبییە کۆن و میللییەی فەرەنسی وەرگرتبێت کە لە ڕێگای هەندێ بالادو فۆرمی دیکەی شیعری گواسترابێتەوە:

«... نەخێر، هێشتا ڕۆژ نەهاتووە، ئەمەش دەنگی چۆلەکە نییە، بەڵکو دەنگی بولبولە لە دوورەوە دێت.»

گۆرانی لیریکی لە ئەدەبیاتی کوردیدا، لەسەر ئاستێکی میللی، لەناو داستان و بەیتە فۆلکلۆرییەکاندا دەدۆزرێتەوە، دەشێ گۆرانییەکانی عەلی بەردەشانی و عەلی حەریری-ش... هتد، بەجۆرێک لە گۆرانی لیریکی دابنێین یان ئەم خاسییەتانەیان هەیە، بەڵام جوانترین نموونە لە ئەدەبی

نووسراوی کوردیدا ئەم سیفەتەی هەبێت، هۆنراوە بەناووبانگەکەی (گوڵی خوێناوی) گۆرانە، کە تێیدا ئاه و حەسرەتی بەیەک نەگەیشتن و بەربەستەکانی نێوان دوو عاشق پێشان دەدات، ئەمەش لەناو فەزاو شوێنێکی بەسیفەت سوارچاکی (Chevaleresque)، وەک بوونی کۆشک و سەرای پاشا... هتد.

**ستایش** Célébration

لە ڕووی واتای فەرهەنگییەوە تێرمی Célébration کە ئێمە ستایش-مان بۆ داناوە، زیاتر بەمانای (احتفاء)ی عەرەبی دێ و ئەمیان پڕ بەپێستیەتی. ئەمەش بەمانای بەرپاکردنی جەژنێک بەبۆنەی شتێک یان کەسێک دێت. فەرەنسییەکەی لە Célébratio- لاتینی هاتووە کە بەمانای جەژنی یادکردنەوەی ڕووداوێک یان بۆنەیەک دێ. هەرچی لەناو ئەدەبە سەرەڕای فراوانی و ئاڵوزی وەک چەمکێکی ئەدەبی، ماناکەی ئەم ڕەگوڕیشەی سەرەوەی تێدایە، بەڵام چوارچێوە و مێژوویەکی دیاری هەیە.

ستایش واتە، کردەیەکی خیتابی یان ئاخاوتنی (کلام)ی کە لە ڕێگای ئەمەوە دەتوانین پێوەندییەک لە نێوان دوو کەس یان دوو شت دروست بکەین، لە شێوەی دوو جەمسەر یەکێکیان باڵادەست بێ. جا ئەم باڵا دەستییە Superiorité حەقیقی بێ یان خەیاڵی، بەچەشنێک تەعبیری لێ دەکرێ عاتیفەیەک بڵاوبکاتەوە کە سیفەتی هەستی فراژووبوون یان هەستی بەرزبوونەوەی (Le sentiment d'élévation)، تێدابێ. لە لایەن ئەریستۆ، ستایش لەپاڵ ژانری دیکەی وەک سەرزەنشت Blame و هی دیکە بەژانرە ئەدەبییە پێشاندەرەکان یان ڕوونکەرەوەکان (Demonstratif) دەژمێردرێ، کە پێشتریش لە لایەن «گۆرگیاس دو لیۆنتیۆم» ئەم جیاکردنەوە هەستی پێکراوە و ئەو دەیگەڕێنێتەوە بۆ هونەرەکانی شێواز (Stylistique). ستایش، ڕۆڵێکی گرینگ و کاریگەری جوانیناسی هەیە، ئەمەش چ لەسەر ئاستێکی خیتابی یان هەموو جۆرە پراتیکێکی شیعری کە بەرهەم هێنەری تێکستی (جوانی)

بێ. پەیدابوونی ئەدەبی ستایش دەگەڕێتەوە بۆ یادکردنەوە تایبەتی (وەک یادی مەرگی پیاوێکی ناسراو...) و گشتییەکان (وەک گشت جۆرە جەژنێکی گشتی سیفەتی شادمانی تێدابێ). لەم ڕووەوە، بۆنە ئاینییەکانیش ڕۆڵێکی گرینگیان هەبووە لە دروست کردنی وەک خیتابێکی ئەدەبی. دەتوانین بڵێین سیمای سەرەکی ستایش بریتییە لە کردەیەک کە گرینگی بەڕووداوی ڕۆژبدا. دەشێ بیگەڕێنینەوە بۆ مەسەلەیەکی دیکەی (أبدی و لازمنی) وەک بوونی چەمکی سروشت لەناو ئەدەبدا کە بابەتێکە پێچەوانەی ئەم خاڵەی سەرەوەیە، بەو مانایەی سروشت شتێکە هەمیشە هەیە و هەمیشە لە دەرەوەی زەمەنە، ئەمەش ئەو باڵا دەستییەیە کە مرۆڤ، مرۆڤی شاعیر هەستی پێ دەکا و بەئەدەب ستایشی دەکا. لێرەش جارێکی دیکە دەگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی هەستی فراژووبوون و بەرزبوونەوە کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا. بەگشتی شتێک نییە لە بووندا نەبێتە خۆراکی ستایش. تەواوی لایەنەکانی دیکەی ئەدەب کە چێوارچێوەی ستایشن: وەک مەدح و پیاهەڵگوتنی ساتیریک (مدح وتقریظ وثناء) «= سەرزەنشت و لۆمە و پاڕانەوە». بێجگە لەمەش شیعر و ئەدەبیاتی تەعلیمی و ئەوانەی ئەم سیفەتەیان هەیە، بەسروودە نیشتمان پەروەرەکانیشەوە، وەک: ڕووداوە گەورەکانی میللەتان و وەچەرخانەکانیان و ڕووداوە میتۆلۆژییەکانیان، دەچنە خانەی ستایش. لەم بارەیەوە، وەک نموونەیەک ئاتینییەکان لە ڕێگای یادکردنەوەی پیاوە گەورەکانیان هەستی نیشتمان پەروەری خۆیان پێشان داوە. دیسان وەک هەستێکی نیشتمان پەروەری ئیزۆکرات کە قوتابی گۆرگیاس بوو باسی باڵادەستی خۆیان، واتە یۆنانییەکان دەکا بەسەر بەربەرەکان (بێگانە-Barbares).

مێژووی ئەم لایەنە ئەدەبییەش، ئەگەر وەک ژانرێکی ئەدەبی سەیری بکەین، بەو شێوەی ئەرستۆ بۆی چووە، دەگەڕێتەوە سەردەمە کۆنەکانی یاداشتی (ذاکرە) مرۆڤایەتی. ئەمەش هەستێکی قووڵە و زیاتر وەک نرخ و بەهایەکی ئەدەبی هەستی پێدەکرێ.

ستایش له ئەدەبی کلاسیکی وەک هونەرێکی شیعری دیار و بەرجەستە هەستی پێدەکرێ. له گشت شیعرە لیریکی و ئیپیکی (داستانی...)یەکان دەدۆزرێتـــەوە. له ئەدەبی نوێش ئەم لایەنە دەشێ بەوالاّیی لەناو هەمـــوو تێکستێکی جوان ئیتر چ شیعر بێ یان ڕۆمان، بدۆزرێتەوە. هەر له سەردەمی یۆنانییەکان، ستایش لەو جەژنانەش دەدۆزرێتەوە کە له شەرافەتی دیۆنیزۆس Dionysos بەرپاکراون، کە بە Dithyrambe ناسراو بوو. هۆنراوەی Epitaphe کـە جـۆرە هۆنراوەیەک بوو لەکـاتی ژن هێنان (زەماوەند)، دەگوترا هەمان سیفەتی ستایشی تێدا دەدۆزرێتەوە.

شیعری (سروود–Epithalame)یش زیاتر تایبەت بوو بەستایش و بەرز ڕاگرتنی مردوو یان مەرگ وەک سیفەتێکی گشتی. ئەمەی دوایی له لایەن هۆمـــیـــرۆس باسی لێکراوە. دەتوانین بلّـــێین له لایەن ســـتـــایشکەرە یۆنانییەکان وەک دیاردەیەک گوازراوەتەوە لای ڕۆمانەکان کە لای ئەوان بۆتە هونەرێک بۆ شەرەف لێنان و ستایش کردنی پیاوە سیاسییەکان.

لەلایەکی دیکە، تەواوی بابەتە لیریکییەکان کە شاعیر له ڕێگای بابەتە بیۆگرافییەکان گەشەیان پێداوە بەپێی ڕوانین و تیـۆرە کۆنەکانی ئەدەبیات دەچنە خانەی ئەدەبی ستایش. له ڕووی ئاینییەوە، له تەورات و ئینجیل، دەیان ستایش کردنی خودا هەیە. بۆ نموونە (سروودی سروودەکان– -Can tique des Cantiques) دەشێ وەک هۆنراوەیەکی زەماوەند حسێبی بکرێ کە ستایشی هەلّگرتووە. ئەو ئەدەبیاتەی کە بۆ شەرافەتی پیاوە پیرۆزە ئاینییەکان گوتراوە گشتیان سیفەتی ستایشی تێدایە. دەشێ ئەمە خالّی سەرەکی بەها ئەدەبییەکەیان بێ. لەناو ئەدەبی کوردی–یش مەولودنامەکان عەقیدەنامەکان ئەوانەی بەشیعر و پەخشان نووسراون هەمان سیفەتیان هەیە.

ئەو هۆنراوانە و ئەو ئاخاوتنانەی (خیتاب) له دەرباری شایەکان گوتراوە کە هێز و دەستەلاّت و بەگزادەیی گیان و جوانی هەلّکەوت و قەلاّفەتی ئەوانی پێشان داوە، نموونەی جوانی ستایشن.

له میژووی ئەدەب و کولتووری شارستانی و میللی کوردی دەشێ بەئاسانی ڕوخسار و بابەتی ستایش بدۆزینەوە. لەناو ئەدەبیاتی فۆلکلۆری و میللی ئەم لایەنە ڕەنگە ڕوونتر بێ. بۆ نموونە ئەو گۆرانییانەی لە سەردەمێکی زوو لە کاتی زەماوەند دادەهێنران و پێداهەڵگوتن بەسەر بووک و زاوا دەگوتران. دەشێ وەک (Epithalame) حسێبی بۆ بکرێ. بەهەمان شێوە بەیتە کوردییەکان.

## کلاسیزم CLASSICISME

ئاوەڵناوی کلاسیکوس Classicus لە زمانی لاتینی بەمانای چینێک یان توێژێک لە هاووڵاتیان دێ. ئەم مانایە لە ئەوروپای هاوچەرخ زوو بزربووە. زۆرجاریش بەمانای ئەدەبی چینێکی دیاری کراو گوتراوە، بۆ نموونە مارکسییەکان کارەکانی پاسکال و بوالۆ و ڕاسین و لافۆنتێن-یان بەئەدەبێکی بۆرژوازی لە قەڵەم داوە، چونکە سەر بەچینێکی دیاری کراوبوونە، بەڵام هەرزوو ئەم ئاوەڵناوە بۆ ئەو بەرهەم و کارانە بەکار هاتوون کە شایانی لێکۆڵینەوە و گرینگی پێدان بوونە لەناو پۆل، ئەدەبی پلە یەک، ئەدەبێک هێز و توانای مانەوە و بەردەوامبوونی هەبێ و بشێ هاوتای کتێبە باشەکانی ڕۆمانی و یۆنانیەکان بێ. وەک گشت تێرمە گشتی و ئاڵۆزەکانی دیکەی ئەدەبی، زاراوەی کلاسیسیزم سەردەمێکی ئەدەبی و هونەری دەگەیەنێ. مانای بەهایەکی ئێستێتیکی و ڕێبازێکی ئەدەبی و هونەری دەگەیەنێ، وەک: سەردەمی بووژانەوە، سەردەمی ڕۆشنایی، ڕۆمانتیزم، سەمبۆلیزم. زاراوەی کلاسیسیزم، پێناسە کردن و دۆزینەوەی مانای دیار و ڕوون و ڕێک شتێکی تابڵێی ئەستەمە، چونکە بەهاو نرخی کلاسیکی (یان کلاسیسیزمی). لەناو هەموو ئەدەبێک و لەناو هەموو سەردەمێک دەدۆزرێتەوە.

وەک ڕەگوڕیشە کلاسیسیزم بەبەرهەمی نووسەرە کۆنەکانی ڕۆمانی و یۆنانی گوتراوە، بەڵام کلاسیسیزم تەنیا لە نیوەی دووەمی سەدەی

حـەڤـدەیەم لە فـەرەنسـا ، وەک ناسنامـەی ئەدەبی و هونەری بەکـۆمـەڵە نووسەرێک گوتراوە کە بەشداری لە هەمان بەهاو نرخی ئێسـتێتیکی بکەن و هەمـان شت کـۆیانی کـردبنەوە. لە مـێـژووی ئەدەبی ئەوروپی، لەم سەردەمەی سەرەوە، هەندێ نووسەری فـەرەنسی هەن وەک: لافۆنتێن- La Fontaine، ڕاسین- Racine، بووسوێ- Boussuet، پووسا Poussin، لۆ برا Le Brun، بەڕوونی سیفـەتی کلاسیسیزمیان بەسەردا پەیڕەو دەبێ، بەڵام لە هەمان سەردەم یەکێکی وەکو بوالۆ- Boileau کەمتر. نووسەرانی دیکەی ئینگلیزی هەمان سەردەم وەک میلتۆن- Milton و درایدن- Dry-den و مارڤێل- Marvell و جۆنز Jones- سیفەتی کلاسیسیزم بەهەمان شێوەی فەرەنسییەکان وەرناگرن، تاڕادەیەکی زۆر هەمان شت ڕاستە بۆ نووسەرانی هەمـان سەردەم لە ئیسپانیاوە: سێرڤانتێس- Cervantes و ئاریۆست- Arioste و لوتاس Le Tasse و پالادیۆ Palladio، کـە هەمووشیان، لە پێش نووسەرانی فەرەنسی ژیاون. بەشێوەیەکی گشتی دەتواندرێ، لە بارەی ئالۆزییەکانی ئەم تێرمە، دەتوانین باسی مێژووی ئەدەبی و هونەری گشت وڵاتانی ئەوروپی بکەین، ئەمەش لە سەردەمە جیاجیاکان، بێ ئەوەی پەنا بۆ زاراوەی کلاسیسیزم ببەین، چونکە ئەم لایەنە دەکەوێتە ژێر ڕوانگە و نیگای ڕەخنەیی هەتا ڕادەیەکیش ئەخلاقی جیـاواز، کـە دەبێ وەک ڕێککەوتنێک یان ئیدیالێکی ئەدەبی و هونەری خوێنەران و نووسەران لە سەری کۆک بن، بەڵام ئەم ڕوانینە بەسەر ئەدەب و هونەری فـەرەنسی پەیڕە و نابێ. ئەمـەش خـۆی لە خـۆیدا بریتـییـە لە دیاردەیەک تایبەت بەفەرەنسەکانە، لە گشت سەردەمەکان دەکرێ دەرسی تایبـەتی و نوێی لێ دەربهـێندرێ. ئەمـەش کـۆنەکـان و ئەوانەی دوای ئەمـانەی سـەرەوەی ناومـان هێنان دەگـرێتـەوە، وەک لە ڤـۆلـتـێـر-ەوە بۆ ستەندال و هوگۆ و یان ژیدو ئەلبێرکامو. لە سەدەی بیستەم کلاسیسیزم تێکەڵی یان بەڕواڵەتێکی نەریت پارێزی - Conformisme خـۆی دادەپۆشێ و لە ناوەوەی فەرەنسا کەمتر سەرنج ڕادەکێشێ و لە هەمان

کاتدا سنوورەکانی کلاسیسیزم باشتر دەردەکەون. بەپێچەوانەوە، لە دەرەوەی فەرەنسا بەتایبەتی لە ئینگلستان و ئەڵمانیا، ئەو ئەدیب و نووسەر و هونەرمەندە (بەتایبەتی موزیکییەکان) فەرەنسییانەی پێشتر بەکلاسیسیزم دەناسران و وەک ئەدەبێکی نەزۆک سەیری دەکرا، جارێکی دیکە لەناو ڕۆشنبیری ئەم دوو وڵاتە باشتر دەخوێندرێنەوە.

بوونی کلاسیسیزم لە لای نوێخوازەکان- Modernes دوو ماناو لێکدانەوە بۆ ئەو ئەدەبە و ئەو بەها ئێستێتیکییانە پێشکەش دەکا. کە لە سەدەی حەڤدەیەم بەم سیفەتە (کلاسیسیزم) ناسرابوون و لەم سەردەمە وەک بووژانەوەیەک دەبینراو پاشتر لە سەدەی هەژدەیەمیش دەنگدانەوە و کاریگەری خۆی هەر مابوو. کە لەناو سەردەمی خۆی وەری دەگرین و بۆی دەڕوانین، دەبینین دوور بووە لە گشت کلێشەیەکی ئەکادیمی، دواتریش ڕوخسارە نوێیەکانی خۆی هەر پاراستووە. دەبینین ئەم ڕوخسارە لە لای گەلێک لە نووسەرانی نوێخواز هەستی پێکراوە و هەبووە وەک لیتۆن ستراشێ- Lytton Strachey ئیلیەت- Eliot، پۆل ڤالێری Paul Valery و ئەندرێ ژید - Andre Gide و... ئەلبێرکامو لەم خاڵە لەگەڵ ئەمانە یەک دەگرێتەوە کاتێ کە باسی ئەم ڕوخسارەی هونەری کلاسیسیزم دەکا و دەڵێ: (حەیاو تەوازوعە). هەمان شت لە لای عەزرا پاوەند Ezra pound هەستی پێکراوە کە دەڵێ: «هەموو ڕەخنەیەک هەوڵێکە بۆ ناسینی کلاسیک.» . بێگومان هەندێ خاسییەتی ئەدەبی تایبەتی فەرەنسی وایان کردووە، کلاسیسیزم بەم چەشنە، لە سەردەمی لویسی چواردەیەم لە فەرەنسا دروست بێ. ئەمەش بۆ خۆی وەک تەزوو و ڕێبازێک هەوڵیان داوە بەلاسایی کردنەوەیەکی ناوەکی ئەدەبێک یان گشتێکی ئەدەبی و هونەری دروست بکەن لە ڕۆمان و یۆنانیە کۆنەکانی بچێ.

وەک خاسییەتی کۆمەڵایەتی ئەدەبی فەرەنسی خۆی، نزیکی نووسەرانی فەرەنسی لە سالۆنە ئەدەبییەکان و دەرباری شاکانیان، خوێندنەوەیان لە لایەن خەڵکێکی تایبەتمەند و باڵادەست. پاشان چەشەی فەرەنسییەکان بۆ

گفتوگۆی ئەخلاقی و ئێستێتیکی و پاشان لەبارەی تیۆرەکانی سروشت و پرسین لە نووسەرەکانیان چۆن کارەکانیان بەرهەم هێناوە. پێوەندی نێوان کاری هونەری و ئەدەبی، ئینجا لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکان.

بێگومان کۆمەڵێک فاکتەری دیکە هەن لە پاڵ ئەو لێکدانەوەی کە فەرەنسییەکان داویانەتە کلاسیسیزم و تەنیا لە لای ئەوان سنوورو پەرژینی بۆ دانراوە و ناسێنراوە. ئەم تێرمە دەشێ تەنیا لە ڕووی (زمن)ەوە بەسەر مێژووی ئەدەبی کوردی پەیڕەو بکرێ، ئەگینا فرێ بەسەر ئەدەب و هونەرەوە لەناو کورد نییە. بەگشتی ئێمەی کورد ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەدەبێکمان نەبووە بەکلاسیک ناسرابێ یان بتوانین بەکلاسیک بیناسێنین. ئەمەش بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەهاو نرخە ئەخلاقییە کلاسیکییانەی کە لەناو کورد نەبووە. دەشێ بۆ گشت ڕێبازەکانی دیکەی ئەدەبی هەمان ڕوانینمان هەبێ، وەک ڕۆمانسیزم بۆ نموونە، بەگشتی ئێمە، دەتوانین بڵێین ئەدەبێکی کۆن-مان هەیە. ئەم ئەدەبەش سەردەمێک نوێ بۆتەوە، ئەمڕۆش ئەدەبی نوێ و هاوچەرخمان هەیە.

## چیرۆکی ئەفسانەیی Contes de fées

چیرۆکی ئەفسانەیی کە ئێمە بەرامبەر Contes de fees-ی فەرەنسیمان داناوە، بریتییە لە گێڕانەوەیەکی زارەکی، مێژووی سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە پێش شارستانی گریک و ڕۆمانەکان، وەک ماددە و کەرەستەیەکی ئەدەبی و هونەریش سوودی لێ وەرگیراوە: ئەمەش لەناو ئەدەبی نووسراو لە کۆن و نوێ نموونەی زۆرە، وەک ئۆدێسەی هۆمیرۆس، هەندێ لە ڕۆمانەکانی یەشار کەمال، بەتایبەتی (کوێر ئۆغلی)، بەڵام لەسەر ئاستی ئەدەبی و کولتووری کوردی، ڕەنگە مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ پێش سەدەکانی ناوەڕاست، یان زووتریش، پێش سەردەمی سەرهەڵدان و سەقامگیر بوون و چوارچێوە وەرگرتنی ئەدەب و زمانی کوردی. لێرەش سەرچاوەکان لە ئەدەبی فۆلکلۆری و میللی دەدۆزرێنەوە.

له خاسییەتەکانی چیرۆکی ئەفسانەیی له ئەدەبی ڕۆژئاوا، پاڵەوانەکانیان بریتین له کەسایەتیی سەرەوەی سروشت– Surnaturels، یان کارێکتەرێکی ئەفسانەیی لەم جۆرەیان هەیە و هەمیشەش بریتین له ژن، ئیتر ژنی باش و خراپ، یان وردتر ژنی چاکەخواز و ژنی شەڕەنگێز و خاوەن دەستەڵاتێکی ئەفسوونی لەبن نەهاتوو.

له ئەدەبیاتی میللیی ڕۆژهەلات بەگشتی و ئەدەبی میللی و فۆلکلۆری کوردی بەتایبەتی، هەمان پێوەندیی دەدۆزینەوە، بەڵام پاڵەوانی سەرەکی ژن نییە، بەڵکو پیاوە، یان بەشێوەیەکی گشتی پیاوە. لەناو کورد، پاڵەوانی سەرەکی کوڕێکە له چینی هەرە سەرەوەی کۆمەڵ (بەگزادە و میر و پاشاکان)ە. دەستەڵاتێکی ئەفسوون ئامێزی هەیە و بەشێوەیەکی گشتی لایەنگیری خێرە، خەباتی ئەو دژی دێوی ڕەشە که ڕەمزی شەڕەنگێزییە و (دێوی سپی ڕەمزی خێرخوازییە و هەمیشە دەستەمۆی پاڵەوانی سەرەکییە). ژن لەم پێوەندییە بەپلەی یەکەم دێ و گەلێ جاریش ڕۆڵی جیاجیا دەبینێ، وەک دولبەر، له وێنەی کچە پاشا و کچە میر، پیرەژن له ڕۆڵی تێکدەر و چقڵ چاندن.

سەرچاوەی ئەم چنینە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی کۆنی کورد (Archaique). لەم چنینە ڕوخسار و سیمای ئایینی کۆن هەستی پێدەکرێ، بەتایبەتی ئایینە دوالیزمەکانی ئێران و میزۆپۆتامیای کۆن، وەک مەزدایزم -Maz daisme و زەردەشتی Zoroastrisme و میتراییزم Mithraisme ، وەک دووانەی ناسراوی (ئەهریمەن و ئاهورامەزدا). بەهەمان شێوە له ئەدەبی ڕۆژئاواش پاڵەوانە ئەفسانەییەکان Fees بنچینەی ناوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ Parques کە کۆمەڵە خواوەندێکی پله دوو بوون یان پایەیەکی لەم جۆرەیان هەبووە و دەگەڕێنەوە سەردەمی ئەو ئایینە کۆنانەی کۆمەڵێک خواوەندیان هەبووە (=Polytheisme) و تاڕادەیەکیش ئەنیمیزم (Animisme) کە بریتی بووە له (أرواحي يان أحيائي= ئەو ڕێبازەی دەڵێ دەروون باوەڕی سەرەکیی بیر و ژیانی ماددییە.) له سەردەمی ئایینی

پیرەمێرد

تاک خوداوەندی (یەکتاپەرستی- Mon-othaisme)، چیرۆکی ئەفسانەیی گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لەناو کریستیانی، بەهۆی مژدەبەرەکان، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاست، کەوتۆتە بەر کاریگەریی ئەم ئایینە و کارێکتەرە کۆنەکانی فڕێداوە. لێرەوە زۆرتر کەوتۆتە ناو ئەدەبی نووسراو، لەناو داستان و بەرهەمە خەیاڵییەکان دەدۆزرێتەوە. ناسراوترین چیرۆکی ئەفسانەیی ئەورووپی، چیرۆکی (لانسلۆی دەریاچەکە- Lancelot)یە، کە لانسلۆ ڤیڤیان لە دەریاچە ڕزگار دەکا و هەڵی دەگرێ و مارلین ئۆنشاتۆر (Marline Enchanteur) دەخاتە ناو بازنەیەکی ئەفسووناوی. یان چیرۆکی مێلوزین Melusine کە پاڵەوانێکە نیوەی ژنەو نیوەکەی دیکەی مارەو پارێزگاری لە خانەوادەی (لوزینان- Lusignan) دەکا، یان تیتانیا-(Titania) کە شکسپیر لە شانۆگەریی (خەونی شەوێکی هاوین) باسی دەکا.

لە چیرۆکی ئەفسانەییدا پێوەندییەکان سەرەڕای جۆرە ئاڵۆزییەکی تایبەت بەگێڕانەوە و شێواز، سادەن، ئەگەر چارەنووس بەخێر و خۆشی کۆتایی بێ، هەردەم هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ توانای عەقڵی و فیزیکیی پاڵەوانەکە، ئەمەش لە گشت چیرۆکەکان هەستی پێ دەکرێ.

## پاکبوونەوە CATHARSIS

لە بارەی تێرمی (Catharsis) بۆ بواری جوانیناسی و هونەر، ڕەنگە (پاکبوونەوە) گونجاوترین و لەبارترین بەرامبەرە کوردییەکەی بێ، ئەگینا ئەم زاراوەیە، گەلێک مانا دەدا و کۆمەڵێک بوار دەگرێتەوە. لە سەرچاوە یۆنانی و لاتینییەکان کۆمەڵێک مانا دەبەخشێ.

لە ڕووی پزیشکییەوە زیاتر بەمانای خاوێن بوونەوە (Purgation) بەکار هاتووە، زۆرجاریش بۆ مەسەلەیەکی وەک (عادە)ی ژنانیش بەکارهاتووە کە جۆرێک لە خاوێن بوونەوەی تێدایە، یانیش بەگشتی بۆ پرۆسەیەک بەکارهاتووە کە ڕژانێکی تێدابێ و لەم ڕژانەش قەتیس بوونێک و گیرانێک هەبێ ئازار دروست بکا.

لە زووێکەوە لەلای ئەفلاتوون، پاکبوونەوە بەمانای (سووکبوونی گیان بەهۆی تێرکردنێکی ڕۆحی یان ئەخلاقی.) بەکارهاتووە و مانا ئێستێتیکییەکەی لەمەوە سەرچاوەی وەرگرتووە، بەڵام لەلای ئەرستۆ فراوانتر بەکارهاتووە. هەر لەبەر ئەمەش دەبینین دەروونناسەکان سوودیان لەمەی ئەرستۆ وەرگرتووە کە لەلای ئەوان: بریتییە لە ئازادکردن و دەردانی تەواوی ئەو عاتیفەیەی ماوەیەکی زۆر لە نائاگایی ماوەتەوە و سەرەنجام جۆرێک لە نیگەرانی دروست کردووە یان دروست دەکا.

لە کتێبی (هونەری شیعر-Poétique) ئەرستۆ پشتگیری لەتراژێدی دەکا بەو مانایەی دەسەڵاتێکی هەیە لە پاککردنەوەیەکی عاتیفی لەلای بینەرانی شانۆ.

دانیشتن بەرامبەر بەدیمەنی نمایش، مرۆڤ خۆی لە هەموو فشارە دەروونییەکان ڕزگار دەکا و لە ئەنجامی تێکەڵبوون لەگەڵ دیمەنە سەرەنجڕاکێشەکان خۆی لەبیردەکا و ئاراستەی دەروون و بیرکردنەوە هاوسەنگییەک وەردەگرێ. لێرەوەش جۆرێک لە نوێبوونەوە و ئاودانی دەروونی هەستی پێدەکرێ. ئەم شیکردنەوەی (پاکبوونەوە)یە بەگوێرەی (ئەخلاق لەنیکۆماک- L'Ethique a Nicomaque) دەگەڕێتەوە بۆ چەمکێک کە هاوسەنگی ژیان پێشان بداو گیانش وەک چەقێک و پێوەرێک. ئەم چەمکە مێژوویەکی درێژی هەیە، دەگەڕێتەوە پێش سەردەمی ئەرستۆش. لە ڕاستیدا، لەلای ئەرستۆ مەسەلەکە سادە کراوەتەوە، دەتوانین بڵێین ئەو پاکبوونەوەی بەعەلمانی Laicisation کردووە یان ڕوخسارێکی

لەم جـۆرەی داوەتێ، کـە مـاوەیەکی زۆر لەناو کـولتـووری کـۆنی یۆنـانی پراتیک کراوە.

تراژێدییـەکـانی یۆنـانی سـەرچاوەیان دەگـەڕێتـەوە بۆ نەریتـەکـانی دیۆنیـزۆس-Dionysos، واتە بۆ حـەقـیـقـەتێک لەیەک کـاتدا تـاریک و ورووژێنەر بێ. ئەم نەریتەش حالەتی تۆقین و تەمەللوککردنی تێدابووە کە ئەنجامەکـانیان بوورانەوە و لەخـۆچوونی قـووڵ بـوونە، لە ڕێگای ئەمـانەوە دەکرا پێوەندییەکی مەست ئامێز و وڕێنە ئامێزی توند لەگەڵ خودا دروست بکرێ، هەر ئەم ئازادبوونە توندەی هێزەکانی گیانی مرۆڤە وردە وردە خۆی لە بونیـادی شـار و نەریتی شـار دەدۆزێتـەوە کـە تێـیـدا تراژێدیا لەدایک دەبێ.

لەلای ئەپۆلۆن- Apollon، پاکـبـوونەوە Catharsis پێـشـتـر وشـە (Orgia)ی بۆ بەکاردەهێنرا کە بریتی بووە لەتەکنیکی تایبەتی پاکبوونەوە و لەلایەن ئەپۆلۆن وەک دەرس و هونەرێک گـوتراوەتەوە. ئەمـەش پێوەندی بەباوەڕی ئـاینی (Orphisme)-ەوە هەیە کـە لەلایەن Orphe دانراوە، وەک تەریقـەتێکی ئـایینی سوودیان لەپاکـبـوونەوە وەرگـرتووە بۆ گـەیشتن بەئارامی گیان و نەمری و دواشتیش گەیشتن بەگیانی خودا.

پاکـبـوونەوە لە فـەلسـەفـەش لەلایەن پیـتـاگـۆرسی-یەکـانیش سـوودی لێ وەرگیراوە، بەتایبەتی ئەو کاتەی مەسەلەی (بینین، ڕوانگە، ڕامان- The-oria) وەک ئامانجێک و مەبەستێک سوود لە تاقیکردنەوەی پاکبوونەوە وەردەگـرن. لەلای ئەفـلاتوون-یش، پاکـبـوونەوە وەک یەکـەم هەنگاوی (ژیانی فـەلسـەفی) وەرگـیراوە، ئەمـەش لە (حەفـتـەمین نـامە-Septieme Lettre) هاتووە.

پاکـبـوونەوە، سـەرچاوەیەکی ئایینیـشی هەیە و دەشێ بەئاسـانی لەناو نەریتـە ئاییـنیـیـەکـان بدۆزرێتـەوە، وەک: تەعـمـیـد و قـوربانی و خـێـر و بەخشش و پاڕانەوە و خۆ دوورگرتن لە خەڵک... هتد.

هەروەها پێوەندی بەمەسەلەی خەڵوەت و پێشاندانی هێز و توانا وەک مەبەستێکی ئیجابی و پاک، وەک: ڕۆژووگرتن، خاوێنی، بێدەنگی، وەرزشەکانی سووک کردن و ئازادکردنی لەش، سەما و گۆرانی و نوێژ.

دەشێ سەرچاوەیەکی ئەخلاقیشی هەبێ، ئەمەش زیاتر لە تیۆری فەزیلەت و چوون و نزیکبوونەوە لە پیرۆزی. بەگشتی، پاکبوونەوە لەلای ئەرستۆ بەمەبەستێکی هونەری بەکارهاتووە و بۆ تێگەیشتن بووە لە کاریگەری نمایش لە بینەران و پێوەندییان پێکەوە. دەتوانین بڵێین لە ڕوانگەیەکی گشتییەوە لە مەودایەکی سەرەوی سروشت (Sur-nature) و سەرەوەی کەلتوور (Sur-Culture) بەکارهاتووە و ڕوخسارێکی ئەفسانەیی و مێژوویی هەیە. مەعریفەیەکە لەبارەی پێوەندی لەش و دەروون، (بڕوانە تەکنیکەکانی هەناسەدان و دەنگ و گوێگرتن و هەڵچوون.) یان تاقیکردنەوەکانی ڕامان و بیرکردنەوە-(Meditation).

## **هەقایەت - چیرۆکی میللی** Conte

تێرمی Conte لە زمانە ڕۆژهەلاتییەکان گرفتێکی گەورەی زاراوەیی دروست دەکات. لە زمانی کوردی کۆمەڵێک بەکارهێنانمان هەیە، وەک: چیرۆکی میللی، چیرۆکی بەرئاگردان. هەقایەت. هەندێ جار بەهەڵە چیرۆکی ئەفسانەیشی بۆ بەکاردێ، کە ئەمەی دواییان سیفەتێکی (سەرەوەی سروشت Surnaturels)ی هەیە و هەقایەت مەرج نییە ئەم سیفەتەی هەبێ و ئەفسانەیی بێ. بەگشتی من هەقایەت و چیرۆکی میللی بەرامبەر بە Conte بەگونجاو و ڕاست دەزانم، چونکە سیفەتی ڕاستەوخۆ دیاری سنوورەکانی ناوەرۆکی ئەم جۆرە چیرۆکە بەڕوونی پێشان دەدا. ئێمە لەناو ڕۆشنبیری کوردی هەقایەت یان چیرۆکی میللی-مان زۆرە.

پۆل دۆلارو Paul Delarue دەڵێ: «هەقایەت بریتییە لە گێڕانەوەیەکی زارەکی زۆر ڕێکوپێک». کۆنترین هەقایەت، هەقایەتەکانی (برایانی میسری)یە کە لەسەر کاغەزی (بردی) تۆمارکراون و دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی

هەشتەمی پێش زایین. پاشان هەقایەتە ئەفسانە ئامێزەکانی ئەتانا Etana و باز Aigle-ی کلدانییەکانە کە لەسەر خشتی سوورەوەکراو تۆمار کراون. بەگشتی هەقایەت ئەمەندە بڵاوە لە جیهان، هەروەکو لە چیرۆکەکان دەڵێن و دەگێڕنەوە هەقایەت لەو شوێنە تەواو دەبێ کە جیهان لێی تەواو دەبێ و دەگەیتە بنی دنیا، لەوێ دیوارێک یان تامانێک کۆتایی بەهەموو شتێک دەهێنێ.

ئەگەر تێرمی هەقایەت و چیرۆکی میللی، وەک زاراوە بەتەمومژی خۆی داپۆشتبێ و نەشێ بناسرێتەوە، ئەوا لە ڕووی ئەدەبییەوە وەک چیرۆکی ئیتنۆگرافی حسێبی بۆ دەکرێ. دەشێ سێ پێوەر دابنێین بۆ ناساندنی ئەم جۆرە چیرۆکە: ١- زارەکی، ٢- فورمی ناجێگیر و ڕێژەیی، ٣- خەیاڵ.

هەقایەت یان چیرۆکی میللی لە ساڵی ١٨٨١ لە لایەن سێبیێو Sebillot بە(ئەدەبی زارەکی) لە قەڵەم دراوە، وەک پەند و مەتەڵ و گۆرانی میللی دەماودەم گێڕدراونەتەوە. بەڕای پییێر سانت ئیڤ Pierr Saintyves، هەقایەت وەک ئەمانەی سەرەوە (زانینی گەل)ن. گشت هەقایەتێک چینێکی هەیە و پێکدێ لە: بێدەنگی، ڕوانین، لاسایکردنەوە، سوارچاکی (بەمانا داستانسەراییەکەی- مەلحەمی). بەشێوەیەکی میللی دەگوازرێتەوە، لەم گواستنەوەدا گۆڕانی بەسەر دادێ، ئەمەش بۆ خۆی وەک کارێکی هونەری میللی یان ئیشکردنێک لەنێو زمان و شێوازی میللی دێتە بەرچاو، ئیتر هەندێ جار بەمەبەستی دەوڵەمەندکردن و هەندێ جاریش بەپێچەوانە دەکەوێتەوە. بەگشتی هەقایەت، سەرچاوەیەکی ئاگایی گەلەکی-یە. Instaint Colectives. چونکە دانەر و داهێنەری دیار نییە، گێڕانەوەشی بەشێوەیەکی پوخت و هونەری دەوەستێتە سەر شارەزایی و لێزانی هەقایەتبێژە میللییەکان و ئەوان کەسایەتی تایبەتی خۆیان دەدەنە پاڵ گێڕانەوەکان. ئارنۆلد ڤان گنێپ Arnold Van Gennep. هەقایەت و چیرۆکی میللی و چیرۆکی ئەفسانەیش (Conte de fees). بە«جۆرە ئەدەبێک دادەنێ کە هەمیشە لە گۆڕاندایە». یەکێ لە خاڵە هەرە

سەرەکییەکانی هەقایەت ئەو خەیاڵەیە کە تیایەتی و ئەمەش بەهەندێ شێوازی تایبەتی دەست پێ دەکات: (هەبوو نەبوو، کەس...) (جارێکیان پاشایەک هەبوو...) (دەگێڕنەوە دەڵێن...) هەر لە سەرەتاوە گشت پێوەندییەک لەگەڵ جیهانی ئاسایی و واقیعی دەپچڕێ و هەقایەتبێژ و گوێگر دەچنە دەرەوەی زەمەن، بەڵام لە کۆتاییەکەی گێڕانەوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش هەیە لەگەڵ واقیع و هاتنەوەی ناو زەمەن و ناو ژیانی ئاسایی کە پێچەوانەی خەیاڵە، کاتێک کە هەقایەتبێژ دەڵێ: (... منیش هاتمەوە کراشم دڕاو چم پێ نەبڕا!)

شێخ نووری

## پەراوێز و مانالێکدانەوە Commentaires

ڕەگی ئەم تێرمە لە زمانی لاتینییەوە هاتووە کە لە عەرەبی بەمانای (شرح و حاشیە و تعلیقات) دێت و لە سەردەمی لاتینی بەمانای تێبینی و بەڵگەنامە دێ وەک: یاداشتی پیاوێکی ناسراو یان تایبەتمەند، ڕۆژنامەی ڕەسمی، تۆمارگە، بەڵگەنامەی دادگایی، دادگا کردنێکی زارەکی. شەرح و مانا لێکدانەوە. لە سەدەی شازدەمین فیلۆلۆژە ناسراوەکانی ئەورووپی لە بارەی زمانە کۆنەکان پەراوێز و دامەننووسی و مانا لێکدانەوەیان کردووە. لەم ڕێگایەوە مانای کتێبەکانیان لێکداوەتەوە. هەر لەو کاتەوەش دەشێ وەک سەرچاوەی ڕەخنە و هۆشیاری ڕەخنەیی سەیر بکرێ.

ئەم دیاردەیە لەناو کولتووری عەرەبی و ئیسلامی لە سەردەمە کۆنەکان وەک شەرح و تەفسیری کتێبە سەرچاوەکان بەکارهاتووە.

ئەمڕۆ وشە فەرەنسییەکە- Commentaires کە ڕەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ

لاتینییەکەی - Commentarii، زۆربەی ئەم مانایانەی سەرەوەی بزر کردووە، تەنیا دوو مانای سەرەکی دەبەخشێ. یەکەمیان بەمانای یاداشت- Memoires دێ، دوومیان مانا هاوچەرخەکەیەتی کە مێژوویەکی کۆنی هەیە. ئەمەش بریتییە لە تێبینی و مانا لێکدانەوەی تێکستێک بۆ تێگەیشتنی زیاتر. بۆ نموونە وەک مانا لێکدانەوە و تەفسیری کالڤا- Calvin بۆ کتێبی ئینجیل. مێژووی ئەم جۆرە نووسینە یان وردتر ئەم شێوازی نووسینە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانی و ڕۆمانەکان. وەک مانا لێکدانەوەی هۆمێر کە بەرەخنەی ئەلکساندرین - Critique alex- andrine، ناسراوە و ئەوەی ڤیرژیل کە بە(Servius Honoratus) ناسراوە. هەروەها تەفسیر و مانا لێکدانەوەکانی قورئان.

پاشان ناسراوترین پەراوێز و مانا لێکدانەوە و تەفسیر بریتییە لە کارەکانی (ابن الرشد-Averros) لە بارەی فەلسەفەی ئەرستۆ و ئەفلاتوون کە دەستێکی بالایان هەبووە لە بلاوکردنەوە یان پاراستن و گەیاندنی ئەم فەلسەفەیە.

لە سەدەکانی دوایی، ئەم شێوازەی نووسینە وەک ڕێگایەک بەکارهاتووە بۆ تێگەیشتنی ئەدەب و دەبینین شوێنێکی گرینگی هەیە لەناو مێژووی ئەدەب، ئەمرۆ لەسەر شێوازە کۆنەکانی پەیڕەو ناکرێ.

**ناواخن** Contexte

ناواخن (یان ناوەرۆک-المحتوی) وەک تێرمێکی (زاراوە) ڕەخنەیی لەلایەن چەند ڕێبازێکی ئەدەبی بەتایبەتی و فەلسەفی بەگشتی بەکارهاتووە. لە ئەدەبی ڕۆژئاوا، بەگشتی دوای تێن Taine و لانسۆ -Lan son لە مێژووی ئەدەب بەکارهاتووە و بۆتە نەریتێکی ڕەخنەیی. مەبەست لەم نەریتە ڕەخنەییە ئەوە بووە ڕەخنەگر بتوانێ ناواخنێک بۆ ئەدەبیات و ئەدیبان بدۆزێتەوە جیاواز بێ یان تەریب بێ لەگەڵ ئەو مێژووەی (وەکو مێژووی ڕووت = مجرد) هەیە. واتە هەوڵدان و تێگەیشتن لە کارە ئەدەبی

و هونەرییەکان لە ڕێگای ژیان و بایۆگرافی-ی دەرەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا مانای واقیع دەگەیەنێ و ئەدەبیاتی ڕیالیزمیش بۆ هەمان مەبەست دەگەڕێتەوە. هەر لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوادا چەند لایەن و بزووتنەوەی دیکەی ڕەخنەیی هەن بەچەشنێکی زۆر گونجاو دیاردەیەکی ڕەخنەیی دیکەیان دروست کردووە بەناوی (ڕەخنەی دانیشگا = Critique Universitaire) گوایە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەمان لێکدانەوەی ڕەخنەیی، بەو مانایەی، ئەو ڕەخنەیەی لە دانیشگا (زانکۆ) دەخوێندرێ زۆر گرینگی بەپێوەندییە دەرەکییەکان دەدا و لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکان پشت ئەستوورن بەدۆکیمەنت و سەرچاوە. دەربارەی تێکستە (دەق) ئەدەبییەکان خوێندنەوەیەکی عەقلانی -Rationelle پێشکەش دەکا. بەهەمان شێوە تەنیا خوێندنەوەیەکی وردی ئەکادیمیانە لە ڕێگای کۆمەڵێک دەستاوێژ، دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە و گەشەسەندن و گرینگیی بەرهەمێکی ئەدەبی. گەلێ جاریش هەر لە ڕوانگەی ناواخن پێشاندانەوە و گرینگی دان بەم لایەنەوە، جیاوازییەک یان بوارێک لە ڕوانگەیەکی دیکەی جیاوازەوە، دەخەنە نێوان مێژووی ئەدەب و ڕەخنەی داهێنەرانە. مەسەلەی ناواخن وەک زاراوەیەکی ڕەخنەیی، هەمیشە بەستراوەتەوە بەزەمینە و خوێندنەوەیەکی (سۆسیۆ - مێژوویی = Socio - Historique) ئەمەش زیاتر لە لایەن ئەو ڕەخنەگرانە بەکار هاتووە کەسەر بەزەمینە و خوێندنەوەیەکی مارکسی بوون. کە بەدوای ئەوە دەگەڕان، یان دەگەڕێن، بەرهەمی ئەدەبی و هونەری بگەڕێننەوە ئەو ناوەندە کۆمەڵایەتییەی لێیدا لە دایک بووە. نموونەش بۆ ئەمە زۆرە، هەرە دیارترینیان بریتین لە لۆکاچ، گۆڵدمان، هێنری لوڤیڤەر... هتد.

بەگشتی لەلای ئەمانە داهێنەر (ئەدیب و هونەرمەند و...) شوێنی خۆیان بۆ فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان چۆڵ دەکەن و ئەم دیاردانە دەبنە دینەمۆی داهێنانی ئەدەبی و هونەری، لەم نێوانە، یان لەم پێوەندییە، داهێنەر (ئەدیب و هونەرمەند و...) بزر دەبن و بەئاستێکی یان بەپایەیەکی

پله دوو دێن، هەڵبەت بەقازانجی چینە کۆمەڵایەتییەکان کە بەڕای ئەوان فاکتەری یەکەمینی داهێنانی هونەرین، نەک خەیاڵ و بیر و چەشە و ڕوانینی دانەر خۆی. بەگشتی ناواخن (ناوەڕۆک) لە تیۆری ئەدەبی پانتاییەکی سەرنج ڕاکێش دروست ناکا یان زیاتر وەک تێرمێکی لاوازی ڕەخنەیی دەبینرێ. لە هەمان کات کێشەیەکی ئەوتۆی ئەدەبی چارەسەر ناکا و لەم بارەیەوە کێشەی گرینگتر و لە پێشتر دەبنە ناوەڕۆکی یان بابەتی ڕەخنەی ئەدەبی.

دەربارەی ناواخن دەشێ هێشتا وردتربینەوە، جەخت لەسەر ئەو دیاردە ڕەخنەییە بکەین کە فاکتەرەکانی واقیع خۆیان بەسەر ڕوانینی ڕەخنەیی دەسەپێنن، بەو مانایەی کە باوە و دەگوترێ: ئەدەب ڕەنگدانەوەی واقیعی مەوزووعییە. لێرەوە بۆمان هەیە بپرسین ئایا ئەو ڕەنگدانەوەیە وەکو ئەو ڕەنگدانەوەیەیە کە ئێمە لە ئاوێنە سەیری خۆمان دەکەین؟ ئەگەر وایە، ئەو زەمینە زاتییەی ئەدەب چی لێ دەکەین کە بەلای تیۆریناسانی ئەدەب بەپلەی یەکەم دێ، وەک غەریزە و عاتیفە و خەیاڵ و ئەندێشە و ژیانی ڕۆحی... هتد، کە لە پاڵ گشت داهێنانێکی ئەدەبی ویڕای کۆمەڵێک تەکنیکی هونەری خۆیان حەشارداوە. لێرەوە شوێنی ناواخن زیاتر ڕوون دەبێتەوە، چونکە مەسەلەی ئەو ڕەنگدانەوەیە بابەتێکە زۆر لێی دڵنیا نین و لێکدانەوە هەڵدەگرێ، سەرەنجام، لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرسیارە دەگوترێ: ئەدەب و هونەر ڕەنگدانەوەی واقیعە یان بەهۆی ئەدەب و هونەر دەتوانرێ واقیعی مەوزووعیش بخوێندرێتەوە؟

## کۆمێدی - کۆمێدیا COMEDIE

کۆمێدی (یان کۆمێدیا) بەو جۆرەی لەناو کولتووری ڕۆژئاوا سەری هەڵداوە، گەلێک ماناو لێکدانەوە هەڵدەگرێ. هەندێ جار لە ڕێگای پێچەوانەکەی: تراژێدی (یان تراژێدیا) پێناسە دەکرێ، بەو مانایەی کۆمێدی بریتییە لەگرێ یان ڕووداوێک کۆتاییەکەی بەخۆشبەختی دوایی

دێ. زۆرجاریش وەک زاراوە بۆ جیاکردنەوەی لە (نمایشی گاڵتەجاڕ یان گاڵتەئامێز Farce) لە کۆمێدی خۆی بەکار دەهێنرێ، ئەمەش بەو مانایەی کۆمێدی لەم جۆرە نمایشە لایەنی ئەدەبی تێیدا زاڵترە. کۆمێدی دەشێ سەرچاوەی خۆی لە ڕووداوی خەیاڵی و فەنتازیا (خەیاڵێکی نائاسایی)ش بدۆزێتەوە. زۆرجاریش کۆمێدی وەک زاراوەیەک بۆ گشت جۆرە نمایشێک بەکارهاتووە و لە زەمانانی ڕۆژئاوا، کۆمێدی بەمانای ئەکتەر-یش بەکاردێ وەک (Comedien).

بەدرێژایی مێژووی سەرهەڵدان و گەشەکردنی کۆمێدی دەیان فۆرم و شێوازی جۆراوجۆری وەرگرتووە و تاڕادەیەک کەوتۆتە ناو گشت بوارەکانی ئەدەب و هونەر. وەک بوونی کۆمێدی لە شێوەی ڕووداوی سادە، کۆمێدی گریان ئامێز (Comedie Larmoyant)، کۆمێدی شوانکارە (Pastorade)، کۆمێدی بالێ Ballet، کۆمێدی پاڵەوانی، کۆمێدی بێهوودە (Absurde)... هتد.

هێشتا قووڵتر، کۆمێدی لە مێژووی گەشەسەندن و ئاڵۆزبوونی، لەگەڵ هاتنی بۆ ناو سەردەمی پیشەسازی و بۆرژوازی، ڕەگوریشە مىللییەکەی خۆی بزر دەکا و لە ئەنجامی هێرشی ئەدەب و ناوەرۆکی درامی یان دراماتێکی، کارێکتەرە سەرەکییەکانی نامێنێ.

کۆمێدی ئەوروپی لە یۆنان لە دایک بووە. لە چوارچێوەی جەژنە نەریت ئامێزەکان کە لە شەرافەتی دیۆنیزۆس-Dionysos (خوداوەندی ئیلهام و سرووش لە یۆنانی کۆن) ئەمەش لە ناوەڕاستی ئەو خرۆشانە میللییانەی کە دوابەدوای مەراسیمی جەژنە ئاینییەکان دەکرا. لەم کاتانەدا کەژاوەیەکیان لە گاڵتەجاڕی و ڕابواردن و ستران گۆتن پێکدەهێنا. ئەم نمایشە میللی و والایە، هەر لە سەدەی شەشەمی پێش زایین لە ولاتانی (دۆری Dorie و مێگار Megar و سقلیە Cicile) نمایشی گاڵتە ئامێز و پانتۆمیم و گێڕانەوەی چیرۆکی ئەفسانەیی ڕێکخراوی لێ پەیدا بوو، بەڵام تا سالانی ٤٦٠ پ.ز بواری ئەوەی پێ نەدرا لە یۆنانی کۆن وەک

نمایشـێکی بەرچاو لە مـیـهـرەجـانەکـان دەرکـەوێ، چونکە بەچاوێکی کـز سـەیریان دەکـرد. لە هەنگاوی یەکـەم کـە لە (٤٥٠) دەست پێدەکـات تا کۆتایی سەدەی پێنجەم، تەنیا کارەکانی ئەریستۆفان Aristophane وەک کۆمێدی دەناسران. لەکارەکانیدا، فەنتازیا گشت شیمانەیەک دەپچڕێنێ و ڕووداوی گـاڵتـەئامـێـز و گـاڵتـەجـاری تێکەڵ بەشـیـعـر دەکـا. زۆرجـاریش واقیعی ڕاستەوخۆی پێ دەخوێندرێتەوە.

خەڵکی سادەی (Attique)ی دەخستە سەر شانۆ ڕاستەوخۆ تەعبیریان لە ڕووداوی ڕۆژانە و سەردەم دەکرد. ئەمەش بەمەبەستی لێدانی نەریتە سیاسییەکان و نەریتەکانی شار. خاسییەتە هەرە دیارەکانی شانۆ و بیری ئەریستۆفان ئازادیی خەیاڵ و شێواز و بیرکردنەوە بووە، بەڵام لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی (پ.ز)ەوە تا نزیکەی ٣٣٠ پ.ز نووسەرانی کۆمێدی تاڕادەیەک لایەنی ساتیریکیـان لە بەرهەمـەکـانیـان کـردەوە، ئەمـەش بە(کۆمێدی ناوەنجی) ناسراوە. خۆراکی ئەمانە زیاتر ئەفسانە و چاودێری کردنی نەریتەکان بووە، بەڵام لەگەڵ هاتنی مێناندر Menandre (٢٥٠-٣٣٠) کۆمـێدییـەکی دیکەی نوێ دروست دەبێ کـە بە(کـۆمێـدی نوێ) ناسراوە و ئەمەیان تێمی (بابەت - Them) خۆشەویستی و مەسەلەی کەسایەتی و مەرجی دیکەی ژیان بەخۆ دوورخستنەوە لە زیادەڕۆییەکانی زمانی کۆمێدی پێش خۆی دەخاتە ناو کۆمێدی.

لەم نێوانەدا، کۆمێدی هەندێ لقوپۆپی لێ دەبێتەوە، نمایشی جیاجیا بەبابەتی کۆمێدی جیاجیا پێشکەش دەکرێ، لێرەوە ئێمە پێناسەیەکی ئەرستۆ Aristote-مان هەیە کە بەم شێوەی خوارەوەیە: «لاسایی کردنەوەی مرۆڤانەی پایە نزمە، نەک لە هەموو جۆرە ژیانێک، بەڵکو لەبواری ئەوەی پێکەنین دەهێنێ، ئەمەش بۆ خۆی بەشێکە لە ناشرینی، چونکە ئەوەی پێکەنین دەهێنێ، خەوشێکە و ناشرینییەکی بێ ئازارو بێ زەرەرە.»

پاشان کۆمێدی، لە شارێکی وەک ڕۆما دەگەشێتەوە کە لەوێش نەریتێکی شانۆی میللی هەبوو. بەتایبەتی لەسەردەمی پلۆت Plaute

(١٨٤-٢٥٤) ئەم سەردەمەش بەسەردەمی (یۆنانی-ڕۆمانی) ناسراوە.

پلۆت تەواوی نەریتە شانۆییەکانی یۆنانی دەهێنێتە ناو ڕۆما، بەڵام لێرەش کۆمیدی بەهەمان ڕۆژگاری یۆنانی تێدەپەڕێ، هەروەکو ئەوەی لەسەردەستی مێناندر لە یۆنان کرا، لە ڕۆمان-ی کۆنیش دەکرێ، لەسەر دەستی کاسیلیۆس Caecilius و تێرەنس Terence کۆمیدی شێلگیری (جدیە) و ڕوخساری ئەدەبی بەسەردا زاڵ دەبێ.

لێرە بەدواوە، بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست تا سەردەمی بۆرژوازی، واتە سەدەی حەڤدە و هەژدە، کۆمیدی وردە وردە وەک ژانرێکی ئەدەبی و نمایشێکی تایبەتی دەردەکەوێ. بێ گومان لەپاڵ گەشەسەندنی شانۆگەریی دیکە و گەشەسەندنی ئەدەبیات. لەسەردەمی لاتین، واتە سەدەکانی ناوەڕاست، ناوەڕۆکی نمایشی کۆمیدی بریتی بوو لە ساتیر و ڕووداوی گاڵتە ئامێز و ڕەمز... هتد.

لەم ماوەیەشدا، وێڕای بوونی کۆمەڵێک فۆرمی میللیی دیکەی شانۆ گەشە دەکات و بەهەمان کاتدا پێچەوانەکەشی (تراژیدیا) بەتایبەتی لەسەردەمی شکسپیر-دا بەقورسی دەردەکەوێ.

لە فەرەنسای سەدەی حەڤدەدا، کۆمیدی نرخ و بەهایەکی ئەدەبی و وەک ژانرێکی سەربەخۆ گەشە دەکا و سەیر دەکرێ. بەتایبەتی دوای ئەوەی چینی ئەریستۆکراسی زیاتر مەیلیان بۆ سیاسەت و ئەدەب و فەلسەفە دەچێ. هەر لەم سەردەمەش ژنان شوێنێکی دیار لەناو کۆمەڵ وەردەگرن. هۆڵی شانۆیی دروست دەکرێن.

ئەمەش بەتایبەتی بەهەوڵەکانی قراڵی فەرەنسا ڕیشیلیو Richelieu بوو. لە ساڵی (١٦٣٠وە بۆ ١٦٣٥) کۆرنێی، شەش کۆمیدی پێشکەش دەکا. لێرەش کۆمیدی بەقورساییەکی زۆرەوە دێتە ناو ئەدەب. لەم سەردەمەشدا باوەڕیان وابوو، دەبێ نمایشی کۆمیدی مرۆڤی پلە ناوەنجی بخرێتە سەر شانۆ و بەسەر هەموو ئەم بەربەستانە سەرکەوێ کە دێنە پێشی

و ئەمەش بەزمانێکی ماقووڵ و کەمێک تایبەتمەند و لەگەڵ شوێن و سەردەم و واقیعدا بگونجێ. بەو مانایەی ئەم جۆرە شانۆبە وێنەیەک لە جیهان پێشکەش دەکا.

لێرەش لەم جۆرە کۆمێدییە پێکەنین بوونی نەبووە، بەڵکو وەک هۆیەکی خۆغافڵاندن و زیاتر خۆناسین بەکارهاتووە، بەڵام لەسەر دەستی مۆلییێر، کۆمێدی بەمانا فراوانەکەی دەچێتە ناو ئەدەبیات و ئەو هێز و گوڕێکی زۆر بەهێز بەکۆمێدی دەبەخشێ، بەچەشنێک کە تیۆریزانە کۆن و نوێیەکان بیریان لێ نەکردبێتەوە. بەم چەشنە لە سەدەی هەژدەمدا نمایشی کۆمێدی دەگاتە لووتکەی پێشکەوتنی.

لەسەردەمی بەپیشەساز بوون و بازرگانی بوونی ئاڵۆزی کۆمەڵدا، کۆمێدیش ئاڵۆزی و پشێوی تێدەکەوێ، خۆی لەناو شانۆگەری بەمانا گشتییەکەی بزر دەکا و وەک کالایەکی شانۆیی ئاسایی سەیری دەکرێ. لێرەوە هونەری دراماتیکی بەپێچەوانەوە سەرکەوتنێکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێ.

ڕۆستان Rostand بەپێشکەش کردنی: Cyrano de Bergerac لە ساڵی ١٨٩٧دا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دەهێنێ و وەک شاکارێک سەیری دەکرێ.

هەر لەم سەردەمەوە، لەگەڵ بزووتنەوەی مۆدێرنیزم و پێ نانە سەدەی بیستەمدا، کۆمێدی جارێکی دیکە دەکەوێتەوە ناو سفێرێکی بووژانەوە و لە دایک بوونەوە. کاریگەریی زۆلا Zola بانگ کردنی شانۆ نووسە گەنجەکان لەم ڕووەوە دیارە. ژوول ڕۆنار Jules Ronard کۆمێدی سەرلەنوێ لەسەر بنچینەی نەریتە کۆنەکان دەژێنێتەوە و هێزێکی دیکە دەداتە کۆمێدی. ژۆرژ کورتەلین George Courteline جۆرێکی دیکەی نوێ لە نمایشی کۆمێدی دروست دەکا. لە ئایرلەندا شاعیران وەک یتس Yeats و سینژ Synge خەریکی کۆمێدی دەبن. لە فەرەنسا کلۆدێل -Clau

سـارتر

del جۆرێک لە نمایشی کۆمێدی گاڵتە ئامێز دەبووژێنێتەوە و خەیاڵ و کۆمێدی تێکەڵی یەکتر دەکا. لەگەڵ کارەکانی سوپەرڤیەل Supervielle و ئیلیەت Eliot و شەهادێ Schehade و فرای Fry-دا، ئاسۆی دیکەی نوێی کۆمێدی لە دایک دەبن کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە. لەناو ڕۆشنبیری و ئەدەبیات و شانۆی کوردی دەشێ بلێین تاقیکردنەوەمان لەم بوارە لاوازە. ئەو پرسیارە دەکرێ، ڕەنگە هێشتا ئەم هونەرە (کۆمێدی) لە دایک نەبووبێ.

**قسەکردن و گفتوگۆ** Conversation et Dialogue

لە زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی بەتایبەتی و زمانەکانی ڕۆژئاوا بەگشتی جیاوازییەکی ڕوون هەیە لە نێوان- Conversation کە ئێمە قسەکردن-مان بۆ داناوە، لەگەڵ دیالۆگ- Dialogue، کە بەرامبەرەکەی بەڕای ئێمە (چونکە مەسەلەکە وەرگێڕانە) دەشێ لە زمانی کوردی گفتوگۆ زۆر گونجاو بێ. بەپێی ئەم جیاوازییەی کە لە فەرەنسییەکە هەیە لە کوردییەکەش بەدەردەکەوێ.

قسەکردن و گفتوگۆ (= دیالۆگ) بریتییە لە دوو لایەنی جیاوازی ئاخاوتن کە مەرجی سەرەکی بەلای کەمی چەند کەسێکی پێویستە.

قسەکردن و گفتوگۆ وەک داڕشتنێکی تێکستی یان دەق ئامێز، مێژوویێکی دوور و ئاڵۆزی هەیە و کۆمەڵێک ئاست و ناوەندی کولتووری و سۆسیۆلۆژی پێشان دەدا. ئەمەش لە مێژووی ئەدەب گەلێک لێکۆڵینەوە و ڕەخنە و تیۆریی لەسەر بنیاتنراوە و ماوەیەکی درێژ لەم مێژووە داگیر دەکا، لە ئەفلاتوون- Platon-ەوە بگرە تا دەگاتە سەردەمی هاوچەرخ.

قسەکردن دەبێ وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی پێناسەی بۆ بکرێ. چوارچێوەی ئەم پێناسەیەش هەر لە سەردەمی دیموکراسی ئاتێنی-یەوە دەگۆڕێ و شێوەی جیاجیای هەیە تا دەگاتە سالۆنەکانی ئەدەبی سەردەمی نوێ.

بێگومان قسەکردنی قاوەخانەیەک وەک هی سالۆنێکی ئەدەبی نییە. قسەکردنی دوو کەسی ئاست بەرزی کولتووری وەک هی دوو کەسی پێچەوانەی ئەمە نییە، دەشێ گفتوگۆ گونجاوتر بێ بۆ ئەمانەی دوایی.

یەکێک لەوانەی گرینگییان بەپۆلێن کردن و ناساندنی قسەکردن و گفتوگۆ داوە، جۆزێف دومێستر- Josephe de maistre-ە، لە کتێبی-شەوچەرەکانی شاری سان پێترسبورگ-

- Les soirée de Saint- petersbourg. لەلای ئەو گفتوگۆ بریتییە لە جۆرێک لە تێکست: ئەم وشەیە هیچ مانایەک لە خەیاڵێک زیاتر نابەخشێ، چونکە پێشنیاری گفتوگۆیەک دەکا کە قەت بوونی نەبووە. شتێکە دروستکراوە. دارشتنێکە وەک هەموو دارشتنێکی دیکە. گفتوگۆ تەنیا بەژمارەی قسەکەرەکان لە قسەکردن جیادەکرێتەوە. واتە چەند کەسێکی دیاریکراو بۆ گفتوگۆ و ژمارەیەکی بێ پایان بۆ قسەکردن.

گفتوگۆ بەپێچەوانەی قسەکردن ئامانج و ئەو شتەی یان ئەو بابەتەی لێی دەدوێن دیارە، هەرچی قسەکردنە بەپێچەوانەیەوە سنووری بۆ نییە و ئازادە.

گەلێک پێناسە هەن لەبارەی قسەکردن- Conversation-ەوە، نووسەر شڤالیێ دو مێرێ- Chevalier de mere-، لە کتێبی (قسەکردن) کە لە ساڵی ١٦٦٩ بڵاوبۆتەوە، ڕای وایە قسەکردن دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە و لە زۆر شوێن دەکرێ، وەک: لە بەیەک گەیشتنی بەرێککەوت، لە سەفەر، قسەکردنی دوو خۆشەویست، یان قسەکردن لەکاتی نان خواردن... هتد.

مێرێ، لە هەمان کات ئامانج و وەزیفەی قسەکردن دیاری دەکا کە بەڕای ئەو زیاتر سەرگەرم کردن و خۆخافڵاندنە.

چونکە کە دوو کەس یان زیاتر دادەنیشن ئامانجی قسەکردنەکەیان لە دەرەوەی سەرگەرم کردن و خۆخافڵاندنە، لێرەوە ئەم قسەکردنە شێوەیەکی ڕەسمی وەردەگرێ و وەک کۆنفرانس و مەجلیس دێتە بەرچاو کە نابێ تێیدا پێکەنین و گاڵتە هەبێ. بێجگە لەمەش مێرێ هێشتا قووڵ دەبێتەوە و دەڵێ: ئەو کەسەی قسە دەکا، ئەگەر بیەوێ خۆش بویسترێ و وەک هاوەڵێکی دڵگیر بێتە بەرچاو، نابێ خەون ببینێ، بەلای کەمی تا پێی بکرێ دەبێ ئەو کەسەی لە بەرامبەریەتی بەختەوەر بکا. ئەمەش یەکێکە لەو خاڵە ڕەسمییانەی کە لە قسەکردندا دەبێ هەبێ کە تێیدا گۆڕینەوەی عاتیفە و سەرنج ڕاکێشان بەلای یەکتری ڕۆڵێکی گرینگ دەگێڕێ، هەڵبەت بۆ هەبوونی قسەکردن.

لابرویێر- La Bryere لە کتێبی (گیانی قسەکردن- Lésprit de la conversation) هەمان ڕوانینی مێرێ-ی هەیە، لەلای ئەو قسەکردن، سەرچاوەی دروستکردنی لەززەتە، ئەمەش بۆ هەردوو لا هەمان ئاستی هەیە. چونکە لە سروشتی مرۆڤ شتێک هەیە کە پێی دەگوترێ خۆ خۆشەویستٌ کردن لەلای ئەویدیکە، سەرەنجام، ئەوەی بۆ قسەکەر ڕاستە بۆ گوێگریش دروستە.

نزیکەی سێ سەدە دوای مێرێ و لابرویێر، لە ناوەند و بوارێکی کولتووری تەواو جیاواز، هەندێ لە سۆسیۆ ئێتنۆلۆگە ئەمریکییەکان وەک: گۆفمان- E. Goffman، براون- P. Brown، لێڤنسۆن- S. Levinson، گەیشتوونەتە هەمان ئەو ڕوانین و ئامانجانەی سەرەوە.

ئەوان ڕایان وایە قسەکردن، پێش هەموو شتێک بریتییە لە چالاکییەکی نەریت ئامێز- Tradition، مەبەستی سەرەکیی بریتییە لە ڕاگرتنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

لە قسەکردنەکان، ڕەوشتی قسەکەر بەپێی پێویستی سەر لێ نەشێواندنی خۆی و پاراستنی ئەوەی بەرامبەری پێناسە دەکرێ. لێرەوە،

ئەم پێناسەیە لەگەڵ هی مێریێ، یەک دەگرێتەوە، کە لەلای ئەو، قسەکردن بەگۆڕینەوەی سوپاس و سڵاو لە یەکتری کردن کۆتایی پێ دێ کە وەک نەریتێکی گۆڕینەوەی خۆشی و لەززەت، سەرەنجام ڕاگرتنی پێوەندییەکان کۆتایی پێ دێ.

بێگومان سەدەی نۆزدەمیش بەهەمان ئاست لێکۆڵینەوە و ڕوانینی لەم جۆرە و بەڵکو ئاڵۆزتریشی تێدا هەبووە، وەک: فەرهەنگی قسەکردن و خوێندنەوە-

- Dictionnaire de la conversation et de la lecture، کە لە ساڵی ١٨٣٥ چاپکراوە، ئەمەیان لە ئینسکلۆپیدیا-ی دیدرۆ- Didrot-ش سەرنج ڕاکێشترە. ئەمەیان: هەموو شتێکی ترسناک و هەموو شتێک کە پێویستە بزانرێ تێیدایە، بەکورتی، کتێبێک نییە، بەڵکو قسەکردنە، قسەکردنی خەڵکی زانا و ئەقڵمەند، قسەکردنێکی گشت ڕوانینێک و گشت سیستەمێک کە بۆ هەموو ئەوروپا دەشێ. نووسەری ئەم گوتارە، ژانین-ە- J. Janin، ژانین مێژووی مرۆڤایەتیش لە قسەکردن پێشان دەدا، هەڵبەت لە گەشەسەندنی قسەکردن. ئەمەش دەکرێ بەدرێژبوونەوە و قووڵ کردنەوەی تیۆرییەکەی مێریێ دابنرێ- ژانین دەڵێ: قسەکردن هەر تەنیا ئەو وشەیە نییە کە لە دەمی مرۆڤەوە دەردەچێ، بەڵکو ئەمەیان زمانی مرۆڤە لەناو کۆمەڵ، بەڵام لەناو کۆمەڵێکی جوان، پاک و ڕێزدار و پوخت، قسەکردن بریتییە لە ئاخاوتنی ڕووکەش یان ڕواڵەت ئامێزی مرۆڤایەتی، ئەمەش بەپلەی یەکەم ڕێز و ستایش گۆڕینەوەیە، وەک زمانێک لەناو زمانی جیهان دەبینرێ.

بەکورتی دەشێ ڕێککەوتن و گونجانی خاڵێکی گشت قسەکردن و ئاخاوتنێک بێ لەنێوان قسەکەران، بەڵام گفتوگۆ (= دیالۆگ) بەپێچەوانەوە، مەرج نییە یەکێ لە پرەنسیپەکانی ئەوەی تێدابێ وەک نەریتێک بێ و پێشتر هەستی پێ بکرێ. ئەم ڕێککەوتن و گونجانە- Consensus، مەرجێکی بنچینەیی نییە لە دیالۆگ. ئەم گۆڕینەوەی

سەرەوە لە گفتوگۆ شانۆ ئامێزەکان، ڕۆمانسییەکان، فەلسەفییەکان، کۆنفرانسەکان، مەجلیسەکان هەستی پێ ناکرێ، زیاتر وەک حاڵەتێکی ڕەسمی دێتە بەرچاو. خوێنەر یان بینەر کەم هەست بەو لایەنە دەکا کە مێرێ ناوی لێ دەنێ:

سڵاوکردنی یەکتر و سوپاسی یەکترکردن. ئەگەر ئەمەش لە گفتوگۆدا هەبێ واتە کۆتایی هاتنی گفتوگۆیەکەیە، بەمەبەست یان بەڕێککەوت، بەگشتی، قسەکردن حاڵەتێکی عەفەوییە و لەسەر بنچینەی گۆڕینەوە دروست دەبێ، هەرچی گفتوگۆ یان دیالۆگە پارچە پارچەیە و عەفەوییەتی تێدا نییەو ڕێککەوتن بوونی نییە.

شیعرییەتی گفتوگۆ: لە هەموو سەردەمێک نووسەران لەبارەی بەکارهێنانی گفتوگۆ پرسیاری تەکنیکی و ئێستێتیکییان لە خۆیان کردووە. دوا کەس لەناو ئەمانە: ئومبێرتۆ ئێکۆ-یە. ئێکۆ لە پاشەکیی ڕۆمانی (بەناوی گوڵی سوور.) دەڵێ: قسەکردن کێشەیەکی گەورەی بۆ دروست دەکردم تەنیا بەنووسین دەمتوانی ئەم کێشەیە چارەسەر بکەم. قسەکردن بابەتێکە تیۆرەکانی گێڕانەوە- narration، کەم گرینگییان پێداوە، کە لە ڕاستیدا خۆی جۆرە دروستکردنێکە؛ حیکایەتخوان قسە بەکۆمەڵە کەسانێکی لێک جیاواز دەکا. کێشەیەکە پێوەندیی بەشێواز-Style-ەوە هەیە، کێشەیەکی ئایدیۆلۆژییە. وەک دۆزینەوەی سەروایەک یان دووبارەبوونەوەی دەنگێک (= assonance) یان پاراگرامێک، (= هەڵەی ڕێنووسی، وەک بەکارهێنانی وشەیەک لە جێگای وشەیەکی دیکە- Paragrame)، خۆی کێشەیەکی شیعرییە، مەسەلەی سەرەکی بریتییە لە پێشاندانی جۆرێک لە توند و تۆڵی.

لەم بارەیەوە مۆریس بلانشۆ -Maurice Blanchant، لە ڕوانینی بۆ بەرهەمە ئەدەبییە ناسراوەکان دەڵێ: گشتیان سەر بەقسەکردن و گفتوگۆیەکی سەرەکی و گەورەن کە حەقیقەتی شاراوە و پڕ لە سۆز و عاتیفە دەدۆزرێتەوە. بلانشۆ چیرۆک و ڕۆمانەکانی هێنری جیمس- -Hen

ry James بەنموونە دەهێنێتەوە- جیمس هەردەم تاریکییەک دەخاتە ناو قسەکردن و گفتوگۆی چیرۆکەکانی، کە گرێ و مەسەلەی سەرەکی تێیاندا پێکدەهێنێ، نەک هەر سەرچاوەی دڵەڕاوکێین و تێکنەگەیشتن دروست دەکەن، بەڵکو سەرچاوەی گونجان و تێکگەیشتنیش. هەر ئەمەشە وامان لێ دەکات سەرەڕای پێکنەچوونی قسە و گفتوگۆ و ڕوانینمان، لەیەکتری نزیک بینەوە، بێگومان مارمۆنتێل- Marmontel، لە کتێبی: «پێکهاتووەکانی ئەدەب- Les éléments de litterature»، (1787)، بەشێکی تەرخان کردووە بۆ (شیعرییەتی گفتوگۆ، تێدا چوار (دیمەن)ی خستۆتە ڕوو. لە یەکێکیان قسەکەران خۆیان دەدەنە دەست گیان یان ڕۆحی خۆیان. دیمەن لەم جۆرە زیاتر پێوەندیی بەتوند و تیژیی دەربڕینی عاتیفەوە هەیە. هەندێکی دیکە پێچەوانەی ئەمەن، لەبەر ساردی و ڕووکەشی دەبێ لەناو ببرێ. لە حاڵەتی دووەم، پێوەندییەک یان شتێکی نهێنی هەیە و بەنهێنی لە نێوان قسەکەران دێ و دەچێ. لە حاڵەتی سێیەم، یەکێ لە قسەکەران پرۆژەیەکی هەیە و دەبێ بەئەوەی بەرامبەری بگەیەنێ، جا لەبەرئەوەی یەکێکیان سارد و سڕ و ناچالاکە، گفتوگۆیەکی خێراو دەوڵەمەند نییە.

لە حاڵەتی چوارەم، قسەکەران ڕوانین و هەست و سۆزێکی سرک و پڕ لە جووڵەو بزووتنەوەیان هەیە، ئەویان باشترین شێوەیە کە بۆ شانۆ دەگونجێ.

بەگوێرەی ڕوانینی مارمۆنتێل و ڤاپێرۆ- Vapereau، کە ئەمەی دواییان لە کتێبی (فەرهەنگی جیهانی ئەدەبیات- Dictionnaire universel de litterature) لەم بارەیەوە بۆچوونی خۆی پێشان داوە، قسەکردن و گفتوگۆ، پێوەر و بنچینەی تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵام لەبەر ئاڵۆزیی جێگیر نەبوونی ئەم بابەتە، لەبەر ڕۆشنایی سێ فۆرمی جیاواز لە یەکتری دەخوێندرێتەوە: تەعلیمی = Didactique، دیالێکتیک= Dialectique، موجادەلە ئامێز= Polemique.

خاسییەتەکانی گفتوگۆی تەعلیمی بریتین لە: ١- یەک لە دوای یەک

هاتنی پرسیار و وەڵام. ٢- یەکێک لە قسەکەران تەنیا پرسیار دەکا، ئەوەی دیکە وەڵام دەداتەوە. ٣- ناهاوسەنگی لە نێوان پرسیار و وەڵامەکان. ٤- سەرەتا هەردەم ناهاوسەنگییەک هەیە، چونکە قسەکەران لە هەمان ئاستی رۆشنبیری نین و هەردەم یەکێک بەرامبەر بەو بابەتەی گفتوگۆی لەسەر دەکرێ دەست رۆیشتووترە. ٥- ئەگەر هەموو شتێک بەرێکی بچێتە پێشەوە، ناهاوسەنگی سەرەتا لە کۆتایی گفتوگۆیەکە پڕ دەکرێتەوە.

ئەم جۆرە قسەکردن و گفتوگۆیە کۆمەڵێک شێوە دەگرێتەوە، وەک تەواوی گفتوگۆی دادگاکان، لێ پرسینەوەکان بەمەبەستی لێکۆڵینەوە، دەعوا بەرزکردنەوە، ئیعتیرافاتەکان، پشکنینەکان... هتد.

دەکرێ بڵێین ئەم جۆرە گفتوگۆیە فۆرمێکی دەزگایی (= institution) هەیە، وەک: قوتابخانە، کۆمیساریا، دادگا، زیندان... هتد.

ئەم جۆرە گفتوگۆیە لە رۆماندا زۆرە. وەک بۆ نموونە: لە بەشی یەکەمی رۆمانی (ژێر مینال)ی ئێمیل زۆلا-E. ZOLA، ئێتیەن لانسیێ- E. Lantier، بەدای کاردا دەگەڕێ، دەگاتە ناوچەیەکی نەناسراو، تووشی پیرێک دەبێ کە لە کان ئیش دەکا و لەمەوە شارەزای باری جوگرافی و ئابووریی ناوچەکە دەبێ. ئەم رۆمانە بەگفتوگۆیەکی دیکەی تەعلیمی دادەخرێ، ئەو کاتەی ئێتیەن، دوای مانەوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانە، بۆ مۆنتسو- Montsou دەگەڕێتەوە، لە رێگای ماوود- Maheude چارەنووسی هاوکارانی دەزانێ. گفتوگۆی لەم جۆرە لە شانۆ و هەروەها لە سەرەتاکانی (هەزار و یەک شەو)یش هەیە کە خاسییەتێکی تەعلیمی هەیە. بەهەمان شێوە لە رۆمانی پۆلیسیش زۆرە، چونکە لێکۆڵینەوە و پشکنینی تێدایە.

گفتوگۆی دیالێکتیکی: رەنگە ئەم جۆرە قسەکردن و گفتوگۆیە لە هەموو ئەوانی دیکە ئاڵۆزتربێ، مەبەستی سەرەکیی هەموو فەیلەسووفێکە: لە نیگای فەیلەسووفەکان بەگفتوگۆیەکی ئایدیالی بەرهەم هێنەر دادەنرێ،

بەڵام لە نیگای تیۆری ناسەکانی قسەکردن و گفتوگۆ بەمۆدێلێکی ئاسایی و سادە دادەنرێ. خاسییەتەکانی گفتوگۆی دیالێکتیکی بریتین لە:

١- بوونی دوو جۆر پرسیار و وەڵام. ٢- بوونی هاوسەنگی لەنێوان قسەکەران و دابەش کردنی بەها هاوبەشەکان. ٣- هەردوولا لە حاڵەتی نەزانی و نەبوونی زانیارییەکی ڕێژەیی دان بەرامبەر بەو بابەتەی گفتوگۆی لەسەر دەکرێ. ٤- هەردوولا لە ڕووی زانینەوە پێش دەکەون. ٥- پرسیار و وەڵامەکان تاڕادەیەکی زۆر لە ڕووی درێژی و کورتی لە ئاست یەکترن.

ئەم جۆرە گفتوگۆیە لەناو گێڕانەوە و شانۆشدا هەیە، پێناچێ پێوەندیی بەساتێکی دیاریکراوی گێڕانەوە هەبێ و لە چرکەیەکی تایبەتی شوێن بۆ گفتوگۆی موجادەلە ئامێز چۆڵ بکا.

گفتوگۆی موجادەلە ئامێز: ئەم جۆرە گفتوگۆیە بەپێی ڕوانینی مارمۆنتێل- Marmontel، بریتییە لە ڕەتکردنەوە، بەتایبەتی کە دەگەینە دۆزینەوەو هەڵماڵینی ڕاستی، یان زیاتر لەو کاتانەدا دەبێ بەدوایدا بگەڕێین کە دەمانەوێ گفتوگۆیەکە ئەنجامێکی دراماتیکی (کارەسات ئامێز)ی هەبێ. خاسییەتەکانی بریتین لەمانە: ١- یەک بەدوای یەک هاتنی گفتوگۆ بەبەرزی و نزمییەکی بەرچاو و بوونی پرسیار و دژە پرسیار. هەردەم لەم حاڵەتە کە پرسیار هەیە، زیاتر سیمایەکی خیتابیی هەیە. ٢- هەردوولا لەناو وەڵام دانەوە و پرسیارکردن قووڵ دەبنەوە و ئەمەش بەزەقی ڕوودەدا. ٣- وەڵامەکان هەردەم کورتن و لە ئاستی پرسیارەکانن.

گۆتە

هەموو کێشە و دووبەرەکییەک سەرەتا گفتوگۆیەکی موجادەلە ئامێزی لەگەڵدایە، بەتایبەتی لە سەرەتادا و پێشتر خۆی بۆ ئامادە دەکرێ. وەک ئەو خەبات و ناکۆکییانەی نێوان ئۆلیس- Ulysse و

دەرۆزەکەر ئیرۆس- Iros لە داستانی ئۆدیسە- Odysse، یان لە نێوان ئێنتێ- Ente و ئاشیل- Achille لە داستانی ئیلیادە- Iliade.

هەروەها جەنگ و موبارەزە و دەمەقالێی بەنموونەی گفتوگۆی موجادەلە ئامێز دادەنرێ.

**لاسایی کردنەوە** Imitation

بۆ گشت هونەرێک، بەتایبەتی بۆ ئەدەب کێشەی لاساییکردنەوە لە کۆنەوە بابەتی پرسیار و بیرکردنەوە بووە، ئەنجامەکانیش گشتیان گەیشتن بووە بەخاڵێکی سەرەکی کە بریتی بووە لەوەی کە ئەم بابەتە دەروازەی تیۆری ئێستێتیکی پێکدەهێنێ و ئەمەش لەو نوختە نیگایەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ کە پێوەندی بەسوودی ئەدەب و هونەرەوە هەیە: (ئایا سوودی ئەدەب و هونەر چییە؟!)

دەشێ بەپێچەوانەوە، کێشەی جوانی- Beau، نەگەڕێنینەوە بۆ لاسایی کردنەوە (= Mimesis) لە کاتێکدا ئەمەیان دەمانباتەوە بۆ (بەرهەم هێنانەوەی سروشت)، لەم حاڵەتەدا بۆمان هەیە گومان لەو پێوەندییە بکەین کە لە نێوان کاری ئەدەبی و هونەری و سروشتەوە هەیە. لە بارەی چەمکی جوانی-یەوە، هیگڵ بەپشتگوێ خستنی دۆگماتیزمی ئەفلاتوون و ئەریستۆ، مەسەلەی ڕووحی لە هونەردا دۆزیبەوە بەگوێرەی کتێبی دەیەمی «کۆماری» ئەفلاتوون، نوێنەرایەتیی ئەو پەرچەکردارە بکا کە مرۆڤی- ڕەمزی ئەشکەوت(١)- پێچەوانەی دەکەنەوە. بەم شێوەیە بەسێ پلە لە حەقیقەتمان دوور دەخاتەوە و ناشبێ بچنە ناو کۆمارەکەی، ئەگەرچی هۆمێر (هۆمیرۆس) دەمێک بوو لەوێ بوو. لەلای ئەریستۆ بەرهەمی شاعیر

(١) مەبەست لە «ڕەمزی ئەشکەوت» لەلای ئەفلاتوون وەهم و تارماییەکە پێچەوانەی ڕاستی خۆیەتی. ئەفلاتوون پەیامی شاعیر یان سوودی کاری ئەدەبی و هونەری بەوەهم و پێچەوانەی ڕاستی دادەنێ. کۆمەڵە خەڵکێک لە دەم ئەشکەوتێک وەستاون، سەیری ناوەوە دەکەن و پشتیان لە ڕۆژە. تارمایی خۆیانیان لێ دەبێتە بوونەوەری حەقیقی، لە کاتێکدا حەقیقەت کە ڕۆژەکەیە لە دواوەیانە.

لاسایی کردنەوەی سروشتە، هەڵبەت بەمەبەستی پیشاندانی ئەو شتانەی کە لە بنچینەدا ئێمە نایزانین. لە کتێبی «پۆێتیکا»، ئەریستۆ ژانرە ئەدەبییەکانی بەپێی بەهای تایبەتی خۆیان ڕیزکردووە، مەسەلەی لاسایی کردنەوە کرۆکی ئەم بەهایانە پێکدەهێنێ وەک: هەرچەند کاری ئەدەبی و هونەری وەهمی ڕاستی پێشان بدەن، ئەوەندە بەربەستە هونەرییەکان نامێنن، بەقەد ئەمەش چێژی ئێستێتیکی ئێمە گەورەترو زۆرتر دەبێ. جا بەپێی ئەم ڕیزکردنەی ئەریستۆ، تراژێدی، چونکە جووڵە و کردەی تێدایە بەپلەی یەکەم دێ، ئینجا داستان.

سەرەڕای ئەم ڕوانینەی سەرەوە، لەلایەکی دیکەوە دەبینین جوانیی نایاب- merveilleux و نزیک لە ڕاستی - vraisemblable لە لای ئەریستۆ، جوانی و دروست دەربڕین لەلای ئەفلاتوون، بریتین لە هەندێ کاتیگۆری یان چەمکی ئێستێتیکی بایەخی لاسایی کردنەوە لەناو کاری ئەدەبی و هونەری کەم دەکەنەوە.

لەلایەکی دیکەوە، پیشاندانی ژیانی ڕۆژانە و ئاسایی، هەروەها هەندێ دیاردەی حەقیقی ناو کۆمەڵ، بابەت و خۆراکی تیۆریی ئێستێتیکیی ناتورالیزمن. ئەمەش جارێکی تر ڕاستەوخۆ دەمانگێرێتەوە بۆ چەمکی لاسایی کردنەوە: لۆکاچ لە کتێبی (کێشەی ڕیالیزم) وەسفی پێشبڕکێیەکی ئەسپ لەلای (زۆلا-Zola) و (تۆلستۆی-Tolstoi) بەراورد دەکا، سەرەنجام دەگەڕێتەوە بۆ ڕوانینەکەی ئەریستۆ، بۆ ئەو کردە و جووڵەیەی کە لە پلەیەکی بەرزدا دراماتیکییە، یان ئەوها خۆی نیشان دەدا. ئێستێتیکای ناتورالیزم و پاڵەوانەکانیان، دواتر لەلایەن پاڵەوانانی «ڕۆمانی نوێ»وە لەناو دەچن و ڕەش دەکرێنەوە. ئەگەرچی لەلای ئەمانەش وەسف کردن بایەخی خۆی هەیە، بەڵام کەمتر ڕاستی دەگەیەنێ، بەڵکو ئەوان ئازادی و ڕەوانی دەدەنە دەستەڵاتی وڕێنە (وەک لەلای ئالان ڕۆب گرێ) و دەستەڵاتی زمان (وەک لەلای کلۆد سیمۆن).

## پەخشانە شیعر Le poéme en prose

... دەتوانین بلێین پەخشانە شیعر، ناولێنان و وەرگێڕانێکی باوی Le-poéme en prose-ە، ئەگەرچی زاراوە فەرەنسییەکە ئاماژەی بۆ (قەسیدە-poeme)ی تێدایە، چونکە دەشێ بلێین لە ڕووی فۆرمەوە هەموو قەسیدەیەک شیعرە (poesie)، بەڵام هەموو شیعرێک قەسیدە نییە. پەخشانە شیعر وەک زاراوە و وەک چەمکێکی ئەدەبی دەگەڕێتەوە بۆ زمان و ئەدەبیاتی ئەوروپی بەگشتی و فەرەنسی بەتایبەتی.

لەگەڵ یەکەم سەرەنجدان ئەم زاراوەیە دووچاری پارادۆکسێکمان دەکا کە بریتییە لە گونجانی دوو شتی دژبەیەک: پەخشان نووسینێکی ئازادە، هەرچی شیعرە، دەوەستێتە سەرکێش و ریتم و سەروا. تێکەڵاوبوونی ئەم دووە دەگەڕێتەوە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم. تا ئەم سەردەمە، (سەردەمی سەرهەڵدانی پەخشانە شیعر) دەتوانرا شیعری کلاسیکی بەشێوەیەکی ڕوون و دیار لە پەخشان یان پەخشانە شیعر جیا بکرێتەوە. ئەو فۆرمانەی لە بواری کێشناسی و هۆنینەوەی شیعر بەکار دەهات، بریتی بوون لە: (هەشت بڕگەیی - Octosyllabe) و (دە بڕگەیی- Deca-syllabe) و (چوارین-Alexandrin)، بەڵام لەگەڵ ڕۆمانتیزم ئەم فۆرمانە پاشەکشە دەکەن و ئازادی و گۆڕانێکی بەرچاو دەکەوێتە هۆنینەوە و شیعر نووسین، ئەمەش سەرەتایەکی تەواو نوێ بوو بۆ لە دایک بوونی ژانرێکی دیکەی ئەدەبی کە پەخشانە شیعرە، بەڵام ئەم گۆڕانە چۆن ڕوویدا و ئەم لە دایک بوونە چۆن بووە؟ دەتوانین بلێین ئەو سنوورەی شیعر لە پەخشان جیادەکاتەوە، تەنیا لە ڕوانگەی ئەوانەوە نەبێ کە شیعر وەک کێش و سەروا دەبینن، ئەگینا ئەم سنوورە وەک کێشەیەکی ئەدەبی کەوتۆتە دەرەوەی وردبوونەوە و پرسیار لێ کردن. سەرەڕای ئەمەش هەردەم بابەتێکی گفتوگۆ بووە و کرۆکی گفتوگۆ ئەدەبییەکانی گرتۆتەوە. ئەمەش لەسەردەمی ڕۆمانتیکەوە درێژەی هەبووە.

وەک خاڵێکی بەرایی و گرینگ، دەبێ ئەوە لەبەرچاو دابنێین کە شیعر هیچ کاتێک خۆی لەو توخمانە دوورە پەرێز نەگرتووە کە پێوەندی ڕاستەوخۆیان بەپەخشانەوە هەیە، وەک مەسەلەی گێڕانەوە، بۆ نموونە لەم بارەیەوە بڕوانە ڕۆمانە شیعرییەکانی ئەدەبی ئەوروپیی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی بووژانەوە، یا داستانە شیعرییە کوردییەکانی وەک: مەم و زین و شیرین و خوسرەو... هتد. ئەم دیاردەیە، بەشێوەیەکی سروشتی پراتیک کراوە و هیچ لەخۆ زۆر کردنێکی تێدا نەبووە.

ڕەخنەگری ناسراوی فەرەنسیی سەدەی نۆزدەم بوالۆ-Boileau بەم بیرەی سەرەوە ناسراوە کە دەڵێ: (ئەو پەخشانە شیعرانەی ئێمە پێیان دەڵێین ڕۆمان) لە هەمان کات مۆدێرنەکان: لە بۆدلێر و ڕامبۆوە بگرە تا سەرەتای سەدەی بیستەم، کە لەسەردەمی ئەوان گفتوگۆ لە بارەی سنوورەکانی ناوەوەی ئەدەبیات گەیشتبووە لووتکە، ئەوان لە دەرەوەی کێش و سەروا و ڕیتمی تەقلیدیی شیعر، لە شیعر دەگەڕان.

پێش ئەمانەش ڕووسۆ-Rousseau و شاتۆبریان-Chataubriand گرینگییان بەپەخشان داوە و بەهەمان ئاستی شیعر بۆ گۆرانی و هەستە لیریکییەکانی خۆیان پەخشانیان بەکارهێناوە. دەتوانین بڵێین دەیان هۆکاری گرینگ هەن لەپاڵ سەرهەڵدانی پەخشانە شیعر. وەک: ڕووخان و کزبوونی شیعری کلاسیکی و سەرهەڵدان و بەهێزبوونی وەرگێڕان و بڵاوبوونەوەی زۆری گۆرانی و بەیتە فۆلکلۆرییەکان و بەهێزبوون و گەشەسەندنی ڕۆمان و چیرۆک، یان ئاڵۆزبوونی مەسەلەی گێڕانەوەی هونەری، هەموو ئەمانە ڕۆڵێکی گرینگیان هەبووە لە لەدایک بوون و سەرهەڵدانی شیعری ئازاد یان پەخشانە شیعر. تاڕادەیەکی زۆر هەمان ڕوانین و هەمان هۆکار بەسەر ئەدەبیاتی کوردیش پەیڕەو دەبێ، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین پەخشانە شیعر لە دوای سەردەمی گۆران-ەوە دەست پێدەکاو تا ئەمڕۆش درێژەی هەیە.

یەکەم کۆمەڵە شیعر کە ئەم سیفەتەی هەڵگرتبێ و وەک پەخشانە شیعر

خۆی ناساندبێ کۆمەڵە شیعری (گاسپاردی شەو- Gaspard de la nuit)ی ئەلۆسیوس بێرتراند- Aloysuis Bertrand -o. ئەم شیعرە نوێیانە خێرا کاریگەری لە بۆدلێر دەکەن کە لە کۆمەڵە پەخشانە شیعری (نیگەرانیی پاریس- Spleen de Paris) بەئاشکرا هەستی پێدەکرێ، هەروەها لەلای ڕامبۆ- Rambeau لە (ئیشراقات- I'llumination)، لەلای لۆتریامۆن- Lautreamon لە (سروودەکانی مالادۆرۆ- Le chantes de maladoror) و لەلای مالارمێ- Malarme-ش هەستی پێدەکرێ. ئەم کاریگەرییە بەدرێژایی سەدەی بیستەم درێژەی هەیە و لەلای شاعیرانی وەک کلۆدێل و شار - Char و هێنری میشو - H.Michaux بایەخی پێدەدرێ و زیاتریش وەک ژانرێکی ئەدەبی دەردەکەوێ.

لە ڕووی خاسییەتەوە، پەخشانە شیعر خاسییەتەکانی هەردوو ژانری سەربەخۆی تێدایە و لەناو فۆرمێکی دیکەی دیاریکراو بەیەکەوە دەژین.

بەڵام پەخشانە شیعر نەکێشدارە و نە سەروادار. لە ڕووی گرافیکییەوە (گرافیک، واتە وێنە، نیگار یان نەخشە. مەبەست لێرە لە فۆرمە، واتە هەر لاپەڕەیەکی نووسین دەیگری، بۆخۆی گرافیکێکە واتە، نیگارو وێنەیەکە.) کورت و درێژی هەیە، هەیە لە چەند پەرەگرافێک پێکدێ. نموونەش لە شیعری ئەوروپی و شیعری کوردیی ئەمڕۆ زۆرە، بەڵام خاسییەتی هەرە دیاری پەخشانە شیعر، ڕەنگە لە یەکێتیی بابەت-دا بێ، یان ئەو بابەتەی چارەسەری دەکا، ئەمەش لە ڕێگای ناونیشانی قەسیدەکەو ئەو جیهانەی پێشکەشی دەکا هەستی پێدەکرێ. هەرچی لایەنی شیعرییە بەپلەی یەکەم بریتییە لەو سترەکتوور و ڕیتمەی بەشێوەیەکی شاراوە تێیدا هەستی پێ دەکرێ. هەر لە بارەی سترەکتووری پەخشانە شیعرەوە، هەندێ جار بەسەر دوو پەرەگراف دابەش دەکرێ. وەک قەسیدەکانی بێرتراند کە لەسەرەوە ناومان هێنا. ئەم پەرەگرافانە بەبۆشاییەکی سپی یان بەچەند ئەستێرەیەک لێک جیا کراونەتەوە. هەمان سترەکتوور دەشێ بەهۆی دووبارەبوونەوەی بابەت و وێکچوون هەستی پێ

بکرێ، یان بەهۆی ڕووداو و جیهانی ناو قەسیدەکە لە ڕووی مێژوویی و زەمەنەوە هەستی پێ بکرێ. لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین پەخشانە شیعر بەهەمان ئاستی شیعری کێشدارو ڕیتم و سەروادار توندوتۆڵ و تۆکمەیە.

خاسییەتێکی دیکەی پەخشانە شیعر، مەسەلەی ڕیتمە، (کە لەلای هەندێ لە ڕەخنەگرو نووسەرانی کورد زۆر بەنەگونجاوی مۆسیقا یان ئاوازی ناوەوە ناسراوە.) ڕیتم خاسییەتێکە ناتوانرێ لە سترەکتووری هۆنراوەی پەخشانە شیعر دابڕێنرێ، چونکە ئەمەیان پێوەندیی بەدروست کردنی ڕستەوە هەیە. ئەمەش لە ڕستەی کورت هەستی پێدەکرێ، لەگەڵ تەواوبوونی، وەک بەیتێکی کێشداری شیعری خۆی نیشان دەداو دێتە گوێ. بۆ نموونە: بێرتراند لە قەسیدەی گزنگ (Aube)دا بەم ڕستەیە دەست پێدەکا: (گزنگی هاوینم ماچ کرد.) بەمەش کۆتایی پێ دێنێ: (کە بەخەبەر هاتم نیوەڕۆ بوو.) (لە فەرەنسییەکەی بەیتە شیعرێکی هەشت برگەییە). ئەم دیاردەیە لە پەخشانە شیعر کەم هەستی پێدەکرێ، زیاتر بەبەیتی درێژ و جۆراوجۆر دەبینرێ. ڕیتم هەندێ جار بەپێی بابەت دیاری دەکرێ. ئەمەش دەکەوێتە بەر ڕوانین و ئەندێشەی شیعری شاعیر و کەرەستەکانی کە دەتوانێ بەیتی جۆراوجۆر دروست بکا، بەڵام لە چوارچێوەی ڕیتمێکی زیندوو و گونجاو.

دەتوانین بڵێین لایەنە هەرە دیار و ناوێزەکانی پەخشانە شیعر بریتییە لەو سووکی و ڕەوانییەی کە لەگەڵ بزووتنەوە لیرکییەکانی دەروون و ناوەوە دەگونجێ و لەرینەوە و شەپۆلی خەونی تێدا بەئاسانی بەرجەستە دەکرێ.

لەناو ئەدەبیاتی ئینگلیزی دەشێ ئەدگار ئالان پۆ، بەیەکێ لە شاعیرە هەرە پێشەنگەکانی ئەم فۆرمە دابنرێ. کارەکانی کاریگەرییەکی زۆریان لە بۆدلێر کردووە. دەبینین بۆدلێر بەم چەشنەی خوارەوە پەخشانە شیعری ناساندووە: (پەخشانە شیعر وەک مۆدێلێکی دەربڕینی تایبەتی دێتە بەرچاو کە لە ڕێگای ئەمەوە دەتوانین تەعبیر لە خەون و نائاگایی بکەین.).

**ئەدەبی ژن، ژنی ئەدیب** Lettre de femme et femme de lettre

ئایا دەشێ بڵـێین ئەدەبێک هەیە تایبـەت بەژنە؟ یان ئەو ئەدەبەی ژن دەینووسێت چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ ئەوەی پیاو دەینووسێت؟ ئایا لە ڕووی تیۆرییەوە دەوترێ ئەدەبی ژنان و ئەدەبی پیاوان؟

لە ڕوانگەی تیۆری ئەدەبییـەوە پرسـیاری لەم چەشنە زۆرکـەم دەکرێت. دەتوانین بڵێین هەربوونی نییە.

بەگشتی بەدرێژایی مێژووی تیۆری ئەدەبی و سەرهەڵدان و گەشەسەندنی ڕەخنە کە لەسەر ئاستێکی جیهانی سەرچاوەکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هێلینی یۆنانی (واتە: سەردەمی ئەرستۆ و ئەفلاتوون و درەنگتریش.) پرسـیارو ڕامانی لەم جۆرە، بەدەگمەن شوێنی هەبووە یان شوێنی بۆ کراوەتەوە یان هەر نەبووە. بێگومان کە نەکراوە، هۆیەکەی ناگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئەدەبی ژن یان ژنی ئەدیب لەناو ئەدەب وەک چالاکـیـیـەکی ڕۆشنبـیـری، بەڵکو ئەم دیاردەیە دەگـەڕێتـەوە بۆ نەبوونی ڕوانگەیەکی سـۆسـیـۆلۆژی بۆ ئەدەب، یان خـوێندنەوە و ناسـاندنی ئەدەب لە حەشارگەیەکی سۆسیۆلۆژییەوە. هەڵبەت لە ئاستێکی تیۆری و ڕەخنەیی.

ئەم ڕوانگەیە و پەیدابوونی دەگەڕێتـەوە بۆ کـۆتایی سـەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سـەدەی بیستـەم کـە لێکۆڵینەوە سۆسـیـۆلۆژییەکـان و گشت ئەو زانسـتـە مـرۆڤـایەتیـیـانەی لە دەرەوەی ئەدەبن: (وەک دەروونناسی و ئەنترۆپۆلۆژی و مێژوو ناسی... هتد.) کە لەسەر دەستی بیرمەندانی وەک (فرۆید و دورکـایم و مـاکس ڤـیـبـێـر... هتـد) چوارچێـوەیان وەرگـرت و کـاریگەرییـان هەبووە لە دامـەزراندن و ناسـاندنی ڕەخنە بەگـشـتی و ئاڵۆزکردنی تیۆری ئەدەب. لەگەڵ ئەمەش، ئەم کاریگەرییانە، هەردەم وەک پەیوەندییـەکی دەرەکی مـاونەتەوە لەسـەر تیـۆری ئەدەب. چونکە، لەهیچ کات و سەردەمێک نەبۆتە یان نەیتوانیوە کرۆکی ئەو خوێندنەوە ڕەخنەیی و تیۆرییەی وەک ئەدەب بۆ ئەدەب یان هونەر بۆ هونەر کە ڕاستەوخۆ دروست

کردن یان بوونی زەمینەی جوانیناسییە و ئەدەب و هونەر وەک پێوەرێک بەکاری دەهێنن بۆ خۆناساندن یان ناساندنی وەک چالاکییەکی ڕۆشنبیری. ئەمەش چ لەلایەن ژنەوە بێت یان لەلایەن پیاوەوە، جیاوازی ناکات.

بۆیە کردنی چەند پرسیارێکی لەم چەشنەی سەرەوە، هەمیشە لە پەراوێزی تیۆری ئەدەبییەوە ماوەتەوە. چونکە لەتیۆرو ڕەخنەی ئەدەبی، تاوتویّ لەگەڵ جیهان و کەرستەو ڕوانینە ئەدەبی و هونەرییەکان- بەزمانێکی دیکە: خەیاڵ و ئەندێشە- دەکرێت. گویّ بەوە نادرێت ئایا ئەمە لەلایەن پیاو نووسراوە یان ژن. لێرەوە، ئەم نیگایە بۆ دیاردەیەکی دیکەمان دەباتەوە، ئەگەر پرسیارێک بکەین و بڵێین، ئایا جیهانی ئەدەبی و هونەری ژنێکی ئەریستۆکراسی و ژنێک لە چینی هەرە خوارەوەی کۆمەڵ جیاوازییان نییە؟ یان پیاوێکی ئەریستۆکراسی و پیاوێکی چینی هەرە خوارەوەی کۆمەڵ؟ هەڵبەت، بەڵام ئێمە لێرەوە لە ڕوانگەیەکی ئیدیۆلۆژی و سۆسیۆلۆژییەوە سەیری ئەدەب و ئەو جیهانە دەکەین نەک بەپێچەوانەوە، ئەمەش تەنیا بریتییە لە سەیرکردنی ئەدەب و هونەر لە ڕوانگەیەکی دیکەی جیاواز لە ڕوانگەی ئەدەب وهونەر خۆیەوە کە زیاتر چەقی تیۆرو ڕەخنەی ئەدەبی پێکدەهێنن. کەواتە ئەم مەسەلەیە وەک پەیوەندییەکی دەرەکی، وەڵامی ئەو پرسیارەمان ناداتەوە سروشتی ئەدەب و ئەدەبی پێ بناسێنین، خۆ ئەگەر بەپێچەوانەش بێت، بەڕۆڵێکی زۆر کزولاواز بەتەنیشت ئەم ناساندنە تێدەپەڕێت. هەر لەبەر ئەمەشە، لە تیۆری ئەدەبی و ڕەخنەدا، زۆر کەم ئەم پرسیارانەی سەرەوە دەکرێن. پرسیارەکانی تیۆری ئەدەبی و ڕەخنەیی زیاتر لەو تێکست و بەرهەمە نووسراوانە دەکرێت کە خۆیان وەک ئەدەب و هونەر پێشکەش دەکەن، ئەو پرسیارە ناکرێت ئایا ئەم تێکستە لەلایەن پیاو یان ژن نووسراوە. ئەگەر وابوایە، لە زوویێکەوە، زاراوەی (ئەدەبی پیاو و ئەدەبی ژن) جێگای خۆی لەناو تیۆری ئەدەبی و ڕەخنە و هونەردا دەکردەوە. زاراوەی (ئەدەبی پیاو) زووتریش سەری هەڵدەدا لە چاو (ئەدەبی ژن)، چونکە لە ڕوانگەی بزووتنەوەی

(مێخوازی= Feminisme) ، تیۆری ئەدەبی لە سەردەستی ئەدیب و نووسەران و فەیلەسووفانی پیاوەوە سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە و ئاڵۆز بووە. بەگشتی تەواوی چالاکییە ڕۆشنبیرییەکان بەپلەی یەکەم، لەم ڕوانگەیەوە مۆرک و ناسنامەی پیاویان هەڵگرتووە، یان ڕوانین و بیرکردنەوەی پیاو یان نێر (Masculin) یان بەسەردا زاڵە، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە، تەواو لە حەشارگەیەکی ئیدیۆلۆژییەوە کراوە یان ڕوانینێکە ئەم سیفەتەی هەیە، واتە خەوشەکانی دیارن، چونکە ئەدەب وەک چالاکییەکی ڕۆشنبیری، مرۆڤ دەیکات، ئەم پرسیارانەش سەرەڕای گرینگیان بۆ کۆمەڵ، یارمەتیی ئەوەمان نادەن یان لەو ئاڵۆزییەمان دەرناهێنن و بڵێین ئەدەب چییە؟ ئایا ئەدەب و هونەر ئەو چالاکییە شارستانی و ڕۆشنبیرییەیە کە ژن دەیکات یان کە پیاو دەیکات؟ نەخێر، ئەم جیاوازی کردنە بەدەگمەن شوێنی لە تیۆری ئەدەبی دەبێتەوە، چونکە هەروەکو لە سەرەوە دڵنیاییمان لەسەر کرد، پرسیارە سەرەکییەکانی تیۆر و ڕەخنەی ئەدەبی ئاراستەی تێکست و بەرهەمە ئەدەبییەکان و ئاست و جۆر و پلەی داهێنان تێیاندا دەکرێت، ئەمەش بێ گوێدان بەجیاوازیی سێکسیی نێوان ژن و پیاو. هەڵبەت، ئەدەبی ژنێکیش لە هەمان ڕوانگەی سەرەوە دەبێ بخوێندرێتەوە.

بێگومان دەشێ ئاخاوتن و خیتابێکی (مێخوازی Feminisme) بۆ سەرجەم خوێندنەوە ئەدەبی و هونەرییەکان بکرێ، وەک گشت ئەو خوێندنەوانەی کە بەپشتگیری زانستە مرۆڤایەتییەکان: (دەروونناسی، سۆسیۆلۆژی... هتد) بۆ ئەم جیاوازییانەی نێوان ژن و پیاو دەکرێت یان ئەدەبی ژن و ژنی ئەدیبی پێ دەناسرێتەوە لەچاو هی پیاو، بەڵام هەمیشە وەک خوێندنەوەیەک لە دەرەوەی ئەدەبەوە هێرش بۆ سەر ئەدەب دەبات.

زاراوەی ئەدەبی ژن یان ژنی ئەدیب، هونەرمەندی ژن، یان هونەری ژنان، لەسەر ئاستێکی شارستانی و چالاکییە ڕۆشنبیرییەکان بەگشتی دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی (مێخوازی Feminisme) ، وەک

بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی جیهانی، ئەمەش سەردەمی تەقینەوە و پەرتبوونی بەناو جیهان دەگەڕێتەوە بۆ ڕاپەڕینی قوتابییان و ڕۆشنبیران لە ساڵی ١٩٦٨ کە لە فەرەنسا و ڕۆژئاوا، وەک وەرچەرخانێک ناسراوە لە مۆدو بیرکردنەوە و بەجێ هێشتن و شکاندنی پەیوەندییە کلاسیکییەکانی نێوان ژن و پیاو و سەرهەڵدانی پەیوەندی و بیرکردنەوە و مۆدیلێکی دیکەی پەیوەندی کە بەنوێخواز ناسراوە کە گۆڕان هەتا لە چەشە و چێژ و پەیوەندی سێکسیش کردووە. هەر لەو سەردەمەشەوە، یان کەمێک دواتر، کاریگەری لەناو ڕۆشنبیریی کوردیش دۆزرایەوە، بەڵام بەگشتی دەتوانین بڵێین لەم بیست ساڵەی دوایی زاراوەی ئەدەبی ژنان و ژنی ئەدیب (ئەدەبی ئافرەتان و ئافرەتی ئەدیب) بەچڕی کەوتۆتە ناو ڕۆشنبیریی کوردی و بواری ئەدەب و هونەر بەتایبەتی، لەگەڵ ئەمەش، من پێمـوایە، دەبێ ژنانی کورد ڕاپەڕینی فیکری و ڕۆشنبیریی خۆیان بکەن، بەڵام کەی؟ ئەمەیان وەڵامەکەی لە ئایندە دەدۆزینەوە.!؟

خاڵێکی دیکەی تیۆری هەیە ناتوانرێ پشتگوێ بخرێ کە پەیوەندی بەمەسەلە دەرەکییەکانەوە هەیە. ئەویش مەسەلەی ناجێگیری چەمک (مفهوم=Notion)ی ئەدەب خۆیەتی. هەڵبەت، ئەدەب وەک چالاکییەکی ڕۆشنبیری بەگشت پەیوەندییە دەرەکی و ناوەکییەکان کاریگەر دەبێت و ئەمەش لەگەڵ گۆڕانە ڕۆشنبیری و مادییەکانی کۆمەڵ هەڵدەکشێ و پێش دەکەوێ و نووچ دەدات و... ئەدەب لە ڕووی تیۆرییەوە لە ڕووی دیاریکردنی چێوەی ناسنامەی تا کوێندەر سنووری ئەدەب دەچێت و لە کوێ ڕادەوەستێت، وەک هیچ زانستێکی دیکە نییە. ئەم بابەتە هەتا بڵێی ئاڵۆزە، بەکورتی، لە ناجێگیری چەمکی ئەدەب، زیاتر پرسیار لەوە دەکرێ چی ئەدەبە و چی ئەدەب نییە؟ ئەدەب کێ دەینووسێ و کێ ناینووسێ؟ لێرەوە ئێمە ڕاستەوخۆ دەکەوینە بەرامبەر هەندێ (استثناء) ئەمەش ئەو ئەدەبە دەگرێتەوە کە دەڵێن (ژن دەینووسێ) ئایا ئەو ئەدەبەی ژن دەینووسێ چۆنە.؟ ئایا ئەدەبەکە خۆی گرینگترە یان ژنەکە، ئایا ژنایەتی نرخێک لەو

پۆل ئوستر

ئەدەبە کەم دەکاتەوە یان زیاتری دەکات. ؟ هەمــوو ئەمــانە وەک پرســیــاری دەرەکی دەکــرێن، نەک وەک پرســیــاری نــاوەکی، چونــکە کـــە ئەدەب و هونەر لـە نــاوەوە دەناســێنین، جــیــاوازییــەکــان لە ڕووی ســێکســیــیــەوە ناکــرێ، ســەرەنجام نـرخی تیـۆری و ڕەخنەیی ئەم دیاردەیە وەکـو ئەوە وایە (ئایا فەلسەفەیەک هەیە تایبەت بێت بەهی ژن).

بەگشتی لە ڕوانگەیەکی سۆسیۆلۆژییەوە دەشێ خوێندنەوە بکرێت بۆ ئەدەبی ژن و ژنی ئەدیب نەک لە ڕوانگەیەکی تیۆری ئەدەبی و ڕەخنەیی خۆی.

**مۆریس بلانشۆ** Maurice BLANCHOT

گەلێک جار ڕەخنەی بلانشۆ بەتاریک و پڕ لە تەمومژ ناسێنراوە. لەگەڵ ئەوەش، بۆ یەکێک بیەوێ لە ئەدەب بگا، ڕەخنە و نووسینەکانی بلانشۆ پلە یەکن. هەروەکو ڕەخنەگرەکانی سەردەمی خۆی، (وەک هێنری میشۆ و باشلار... هتد) ئەدەبێکی تۆکمە و تـوند و تۆڵی بەرهەم هێناوە و بەهەمان شێوە، مێتۆدی نووسینیشی هەمان ئاستی هەیە. لەم ڕووەوە هەندێک وای بۆ دەچن کـە بلانشـۆ بەرهەمـهـێنەری تێکست-ە. یەکـێکی وەک (Roger Laporte) لە بارەی بلانشۆ دەدوێ و وای بۆ دەچێ گفتوگۆ لە بارەی ئەدەب و ســتــیلی بلانشــۆ شــتــێکی مــەحــاڵە. شــێــوازی بلانشــۆ وەک ڕەخنەگرێک بریتییە لە پشتگوێ خستنی تەفاسیلەکانی مێژووی ئەدەب و ڕاســتــەوخــۆ چوونە بەرەو جــەوهەری ئەدەب و مــاهـیـیـەتی ئەدەب. «گــریمان ئەدەب ئەو کـاتـە دەست پێدەکـا کـە خـۆی وەک پرسـیــارێک ڕووبەڕوومـان دەبێتەوە.» لەم ڕووەوە بەرهەمەکانی بلانشۆ پرسیارکردنەوەی بەردەوامە لە

مەسەلەی نووسین خۆی: چۆن بزانین و بەچی بزانین نووسین تاقیکردنەوەیە؟ پێوەندییەکانی نێوان بوون و زمان، بابەت و وشە، نووسەر (یان دانەر) و بەرهەمەکەی چین؟ بەکورتی، نووسین خۆی چ مانایەک دەگەیەنێ؟ ئەمانەن ئەو پرسیارانەی کە بەڕواڵەت سادەن، بەڵام لە حەقیقەتدا بیرکردنەوە لێیان سەرسوڕهێنەرن، خۆراکی ڕەخنەی بلانشۆ-ن. لەم گەڕانە ئەدەبییە، بلانشۆ لە دروستکردنی ساختمانی ئەدەبی خۆی، دەگەڕێتەوە بۆ هیگڵ، نیچە، هایدگەر و میرلۆپۆنتی. بلانشۆ هەوڵی داوە بەهەمان شێوەی کانت پرۆژەی (ڕەخنەی)ی خۆی بنیات بنێ: «بەهەمان شێوەی کانت لە «ئەقڵی ڕەخنەیی» ، کە لە بارەی مەرجەکانی ئیحتیمالی تاقیکردنەوەی زانستی-یە، بەهەمان شێوە ڕەخنە بەستراوەتەوە بەگەڕان بەدوای ئیحتیمالی تاقیکردنەوەی ئەدەبی.» لێرەوە، وا پێدەچێ ئەدەبێکی لەم جۆرە نزیکبوونەوە بێ لە دەروازەی فەلسەفە، بەڵام ئەدەبی بلانشۆ لە کێشە فەلسەفییەکان وەک: پێوەندیی نێوان بوون (مرۆڤ) و جیهان، نزیک نابێتەوە، بەڵکو سەروکاری زیاتر لەگەڵ پارادۆکس و زمان و ئەفسانە و شیعرییەتەوە هەیە.

بەشێک لە تیۆری بلانشۆ لەسەر بنچینەی پێوەندیی دانەر (نووسەر و شاعیر) و بەرهەمەکەی، بوون و نووسین دامەزراوە. لە ڕێگای گرینگیدان بەنووسەران و شاعیرانی وەک: ساد- Sade، هۆلدێرلین- Holderlin، ڕامبۆ- Rambaud، لۆتێریامۆن- Lautereamon، مالارمێ- Mal-larme، ڕیلک- Rilke و کافکا- Kafka تەواوی فەزای ئەدەبی و ڕەخنەیی خۆی بنیات ناوە و ڕوانینەکانی لەم بارەیەوە دەخاتە ڕوو. لە بارەی ئەم پێوەندییەی سەرەوە، هەردەم بەڕای بلانشۆ، لەنێوان دانەر و بەرهەمەکەی موفارەقەیەک (پارادۆکس)ێک هەیە. ئەو نووسەرەی کە لە بەرهەمێکی خۆی دەڵێ «من تەنیام» دەیەوێ پەیامێک بەخوێنەر بگەیەنێ وەک: «من بەدبەختم» واتە نووسەر لەم پێوەندییە دەیەوێ گەشە بەبێ هیوایی خۆی بدا ئەمەش لە چوارچێوەی شێوازێکی جوان و تۆکمە و

تونددوتۆڵ و ڕەوان. ئەمەش ئەو بۆچوونە دروست دەکـا وەک: «ئەو بەدبەختەی کە گەلێک باش دەنووسێ.» لێرەشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دەڵێ: «نووسەر (یان دانەر) خۆی لەناو حاڵەتێکی کۆمێدی دەدۆزێتەوە و هیچی نییە بڵێ و هەمیشە وەک جێبەجێکردنی پێویستییەکی گەلێک چارەنووسساز ناچارە درێژە بەنووسین بدا.» هەر ئەم پارادۆکسەیە کە لە نێوان نووسەر و بەرهەمەکەی هەیە، بلانشۆ-ی بۆ لێکدانەوەی قوولتر، بەپشت بەستن بەشیکردنەوەی هیگڵ بۆ (کارکردن) ڕاکێشاوە. «کار بوون دروست دەکا ئەمەش بەلەناوبردنی و بەرزی دەکاتەوە بەنەفی کـردنی.» نووسەریش لە ڕێگای کـاری نووسین دروست دەبێ و بەکردنی دەبێتە ئەوە کە هەیە.

لەلایەکی دیکە بلانشۆ زۆر گرینگیی بەمەسەلەی پێوەندیی نێوان مەرگ و زمـان داوە. ئەمەش لە ڕێگای: (نووسین وەک ئیسپات و نەفی بوون. یان وەک کارێکی بێ پایان و لەبن نەهاتوو، وەک ئەو تێکستەی کە تەواو دەبێ لە نووسەرەکەی یان دانەرەکەی جیادەبێتەوە.) لەم ڕوانگەوە بلانشۆ بنچینەی ڕەخنەیەکی بەرینترو ڕادیکاڵتری دامەزراندووە.

وەک: زمـان کە لە ڕوانگەی ئەو شیمانەیەکی ڕەهایە، نەفی کردنێکی ڕەهایە، وەک ئێستە، ئامادەگی - Presence، وەک نادیاری - absence: «کە قسە دەکەین و دەدوێین ڕاستەوخۆ خۆمان دەکەینە فەرمانڕەوا و وەستای شتەکان و ئەمەش تێرمان دەکا. کە ناوی بۆ نموونە ژنێک دێنم یەکسەر دەبێتە هی من. بۆ ئەوەی بتوانم بڵێم ئەو ژن-ە، دەبێ بەهەر چەشنێک بێ، لە گۆشت و ئێسقانی دابڕێنم و بیکەمە یان بیخەمە ناو حاڵەتێکی نادیار و نەبوون. وشە بوون-م دەداتێ، بەڵام دابڕاو لە بوون خۆی. ئەمەش خۆی لە خۆیدا نادیاری و نەبوون-ە... بلانشۆ دەڵێ: «کە قسە دەکەم، ئەوە مەرگە لەناو من قسان دەکا... من چیتر ئامادەگیی خۆم و حەقیقەتی خۆم نیم، بەڵکو ئەوە ناوی منە کە ئامادەگییەکی مەوزووعیی هەیە و تەجاوزی خۆم دەکا...»

ئەدەب لە ڕوانگەی بلانشـــۆ ڕۆڵێکی هەیە بریتـــیـــیـــە لە گـــەیشتن بەو دیوی سنوورەکـانی زمـان. وەک وەزیفـەیەکـیش ئەوەی ســـەر هەڵدەداو دەبینرێ بەردەوام بزر دەبێ: «توانا و بەهرەی بزر کـــردنی شت.»

ڕۆمانیزم

کـۆژیتـۆی بلانشـۆ، بەپێی گـشت ئەم ڕووانینەی ســەرەوە بریتـــیـــیـــە لە (من بیـردەکەمـەوە، کـەواتە من نیم.) ئەمـەش لەناو وەســـفـی بزربوون و دیار نەبوون و مـەرگی ناو زمـان هەستی پێدەکـرێ. پاڵەوانەکـانی بلانشـۆ ناتوانن بلـێن (من)، ئەگـەر بشـلـێن هەر زوو دەبنە (ئەو). یەکێ لە پاڵەوانەکـانی لە کتێبی (چاوەڕێکـردن و لەبیرکـردن.) لەناو پێوەندییە ئەبستـرێتەکان غەرق ببوو، نەیدەتوانی بلێ: (من دەترسێم.) بەڵکو دەیگوت: (ترس). دەشێ، ئەم نموونەیە جوان فەلسەفەی ڕەخنەیی بلانشۆ ڕوون بکاتەوە، کە مەسەلەی بزربوون لەناو زمان پێشان دەدا، ئەمەش لەخۆیدا هۆشیارییەکی بێ بابەتە. بلانشـۆ دەڵێ: «من فەرمـانڕەوای زمان نـیم، تەنیا لە کاتی ڕەش بوونەوە و بزربوونی گوێی لێ دەگرم کە ڕەشم دەکاتەوە و بزرم دەکا، بەرەو ئەو سنوورە بێدەنگەی کە تێیدا چاوەڕێی ئەوە دەکا سەرلەنوێ فەرمـانڕەوایی بکەینەوە کـە قـسـان دەکـەین،... هتـد) (بلانشـۆ لە سـاڵی ١٩٠٧ لە دایکبـووە و ئێستاش لە ژیاندایە.)

**گێڕانەوە** NARRATION

دەشێ لە زمـانی کـوردی گـێـڕانەوە هاوتایەکی زۆر گونجـاوی Narration بێ کە لە زمانی عـەرەبی هاوتاکەی (السرد) و ئەمـەی دواییـان مەوداکـانی زۆر ڕوون نەبێ.

گێڕانەوە، وەک چەمکێکی ڕەخنەیی و ئەدەبی نوێ، وەک کێشەیەکی ئەدەبی ئاڵۆز کە هەردەم دەمانگەڕێنێتەوە بۆ مەسەلەی ژانرەکانی ئەدەبی، لەناو ئەدەبی ڕۆژهەڵات و ئەدەبی کوردی، مێژوویەکی کۆنی هەیە و بەچەند هەنگاو و وەرچەرخان و گۆڕاندا تێپەڕیوە.

گێڕانەوە کە پێوەندیی بەڕەگ و ڕیشە یان بنچینەی هونەرەکان و بەشەکانی ئەدەبەوە هەیە، تا ئەمڕۆش لەناو ئەدەب و ڕەخنەی کوردی، لە بواری لێکۆڵینەوە تیۆرییەکان، سەرەنجێکی ئەوتۆی نەدراوەتێ، لە کاتێکدا، ئەم بابەتە، بنچینەیەکی یان خاسییەتێکی بنچینەیی لە شیعری لیریکی و ئێپیکی کوردی، (وەک سەرەتا و سەرهەڵدان) دواتر لەناو ڕۆمان و چیرۆک و داستانە فۆلکلۆری و بەیت و چیرۆکە ئەفسانەیی و میللییەکان دەبینرێ. ئیمڕۆش لە ئەدەبی هاوچەرخی هەموو نەتەوەیەک وەک بڕبڕەی پشتی شێوازی هونەری لە چیرۆک و ڕۆمان و شانۆگەری هەستی پێدەکرێ. سەرەڕای ئەم گرینگییە و ئەم شوێنە ئاڵۆزە، کەچی ئیمڕۆش، لەناو ئەدەبیاتی کوردی وەک بابەتێکی دیار لێکۆڵینەوە و پشکنینی ئەدەبی لە بارەیەوە زۆر کەمە.

کاتێک باسی گێڕانەوە دەکرێ کە تێکستێکمان لەبەردەستە و ڕووداوی یەک بەدوای یەکدا هاتوو دەگێڕێتەوە، ئینجا ئەو ڕووداوانە خەیاڵی یان حەقیقی بن، پاڵەوان و شوێن و کردەی تێدا بێ و لە هەمان کات گێڕەرەوەش هەستی پێ بکرێ.

خاسییەتە هەرە سەرەتاییەکانی گێڕانەوە لە تێکستێکدا هەستی پێدەکرێ کە گێڕەرەوەیەک (یان حکایەت خوانێک) ڕووداو یان چیرۆکێک لەناو ناواخنێک یا پێکهاتوویەکی شوێن ئامێز و زەمەن ئامێز (Spatio-temporel) بگێڕێتەوە، لەسەر بنچینەی بوونی سەرەتایەک و کۆتاییەکی ڕوون.

گێڕانەوە لە تێکستێکی ئەدەبیدا (شیعری یان پەخشانی) بەرهەمی دوو

شت یان دوو توخــمــه. یەک: ڕووداو یان مــێــژوو: واتە ئەو بابەتەی کەرستــەی گێڕانەوەکەیە. دوو: گــێڕانەوە خۆی. لێرەش بەپلەی یەکەم مەبەست لە چۆنیەتیی گــێڕانەوەیە. هەر بابەتێک یان ناوەرۆکــێک دەشێ بەزۆر شــێواز بگێڕدرێتــەوە، هەڵبــەت ئێمــە لێرەوە ڕاستــەوخــۆ تووشی بابەتێکی دیکە دەبینەوە کە پێی دەوترێ شێواز یان -style- یان هونەری گــێڕانەوە. بەهای ئەدەبی و بەهای جوانی لە هەر کارێکی ئەدەبی لێرەوە دەردەکەوێ.

شــوێن و زەمــەن لە گــێڕانەوە بەهەمــان ئاستــی کەرستــە ئەدەبییــەکــە گرینگییان هەیە و بەشێکی گرینگی بڕبڕەی پشتی گێڕانەوە پێکدەهێنن. بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان و دەرکەوتنی شوێنەکان و ئەو وێنەیەی لە خەیاڵی گوێگر دروست دەکەن، مەسەلەی گەشەسەندنی ڕووداو و سەرەتا و کۆتایی پێشان دەدەن.

گــێڕانــەوە هەردەم لەســەر زاری یەکــێکە، (ئەمــەش بەگــوێرەی جــۆری ئەدەبەکە و سەردەمەکە دەگۆڕێ.) هەڵبەت لێرەوە دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان گێڕەرەوە (یان حکایەتخوان) و دانەری کتێبەکە، ئەمانە هەمان کەس نین. (ئەگــەرچی لە ڕوانگەی ڕەخنەی فــینۆمــینۆلۆژی جیــاوازی نــاکــرێ لە نێوان نووسەر و ڕۆماننووس.) گێڕەرەوە لەناو تێکست خۆی حەشارداوە.

بۆ ئەوەی بتــوانین لە تێکستێکدا دەستنیشــانی گێڕانــەوە بکەین و شی بکەینەوە، چەند خاڵێکی گرینگ هەن دەبێ دەستنیشــانیان بکەین: یەک: یەک بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان: مۆپاسان لە چیرۆکێکدا دەڵێ: (... مێوانەکان ڕۆیشتن، تەنیا دایک و باوکی کچە بەتەنیا مانەوە، نیوەشەو بووکی تازەیان بەقوڕگی پڕ لە نزگرەوە خەواند...) لەم پارچە چیرۆکە هەموو شتێک، ڕووداو، کەسەکان، بەرێکی و گونجاوی گەشە دەکەن. مەرج نییە، لە گێڕانەوە، ئەم یەک بەدوای یەکدا هاتنی ڕووداوەکان هەردەم بەئاراستەی گەشەسەندنی ڕووداو بڕوا، بەپێچەوانەوە هەندێ جار گەڕانەوە بۆ دواوە هەیە، ئەمەش هیچ لە گێڕانەوە ناگۆڕێ، بەڵکو ئاڵۆزی دەکا. بەڵام لێرەوە

حسێبی ئەوە دەکرێ، ئەم گەڕانەوەیە هەڵکەوتێکی هونەریی هەیە یان بەپێچەوانەوە. دوو: خێرایی گێڕانەوە: دەشێ لە گێڕانەوە سەردەمێکی درێژ بەرستەیەک کورت بکرێتەوە. یانیش دەکرێ بۆشایی (   ) سپی بەجێ بهێڵرێ بۆ دەربڕینی زەمەن و کورتکردنەوەی. دەکرێ بەدیمەنێک سەردەمێکی درێژ و ڕووداوێکی ئاڵۆز پێشان بدرێ مانای تەواو بەخوێنەر بگەیەنرێ. سێ: زمان: هەر زمانێک خاسییەتێکی تایبەتی و زەمەنێکی گرامەریی تایبەت بەخۆی هەیە لە گێڕانەوە، وەک: ڕابردووی تەواو. ڕابردووی بەردەوام. ڕابردووی دوور. کەسەکان: یەک و دوو و سێ.

لەو ڕۆمان و چیرۆکانەی حکایەتخوان لە نووسەر جیاناکرێتەوە یان هەردووکیان یەک کەسن، هەردەم بەکەسی یەکەمی تاک دەنووسرێ. لە هەندێ ڕۆمان و چیرۆکی دیکە ئەم ناسینەوە و تێکەڵ بوونە بەئاسانی هەستی پێ ناکرێ. تەنیا لە ڕێگای هەندێ نیشانە و وشەی تایبەت هەست بەنووسەر دەکرێ، بەڵام بەپێچەوانەوە، تەواوی ڕۆمانەکانی سەدەی نۆزدەمی ئەورووپی، بەکەسی سێیەمی تاک نووسراون، لێرەوەش ڕاستەوخۆ هەست بەنووسەر دەکرێ، ئەگەرچی بەزۆر شێوە و شێواز خۆی پێشان دەدا.

گێڕانەوە وەک ڕەگ و ڕیشەیەکی هونەرەکانی ئەدەب، لەناو ژانرە ئەدەبییەکان بەپێی سەردەم هەستی پێدەکرێ و خاسییەتێکی تایبەتی هەیە: لەناو ئەدەبیاتی کوردیی کۆن، لە شیعرە ئێپیکییەکان بەگشتی هەیە. ئیمڕۆش: لە چیرۆک و ڕۆمان و هەقایەت و چیرۆکی ئەفسانەیی دەدۆزرێتەوە. هەروەها لە شانۆگەری و هەندێ لێکۆڵینەوەی تایبەتیش.

**شیعری تەعلیمی** Poesie Didactique

لە ڕوانگەی منەوە بەکارهێنانی (شیعری تەعلیمی) لە جیاتی هەر وەرگێڕانێکی دیکە لە بارترە و گونجاوترە و مانا و مەبەستی ئەم جۆرە شیعرە، وەک دیاردەیەکی ئەدەبی بەڕوونی دەگەیەنێ. لە لایەکی دیکە، ئەم ناو لێنانە (شیعری تەعلیمی- Poesie Didactique) دەمێکە ڕۆیشتووە.

بێگومان دەشێ لە بەرانبەرەکەی بەدوای ناولێنانی دیکەدا بگەڕێین، وەک: شیعری فێرکاری یان فێرکەر، بەڵام ئەم وەرگێڕانە دەبینین وەک بەردیک لە جێگای خۆی نییە.

مەبەست و ئامانجی سەرەکی شیعری تەعلیمی، فێرکردن و فێربوون و بوونی گەیاندنی وانەیەکە، وەک: فەلسەفی، ئەخلاقی، زانستی و تەکنیکی. ئەگەر لایەن و خاسیەتەکانی ئەم جۆرە شیعرە ئاسانی هەڵگرتن بێ لە یاداشت، دەبینین وێڕای ئەم کارێکتەرە، شیعر لە سەرەتاوە بۆ ئەوە بەکار هاتووە وانە و دەرسێک بگەیەنێ. وانە و دەرسی وەک سروشت ئامێز- Oracle یان پەند و حیکمەت- sentences... هتد. لە سەرەتاکانی ئەدەبیاتی یۆنانی لەم ڕووەوە ئێمە هۆمێر یان هۆمیرۆس- Homere-مان هەیە. هەروەها ئەم دیاریدەیە لە لای هێزیۆد- Hesiode-یش هەیە کە موزێس- Muses دەڵێ: (ئێمە دەزانین هەزاران درۆی وەک ڕاستی بگێڕینەوە، بەڵام ئەوەش دەزانین ئەگەر بمانەوێ بانگی ڕاستی-یش بدەین.) هەر لە لای یۆنانییەکان، بێجگە لەو شیعرە حیکمەت ئامێزانەی کە بەچیرۆکەکانی ئیزۆپ ناسراوە و نموونەی نایابی شیعری تەعلیمین، بەرهەمێکی دیکەی زۆری شیعری پەند و حیکمەت ئامێزی دیکە هەن کە لە لایەن کسێنۆفۆن- Xenophone، پارمێندیاس-Parmenide وئەمپێدۆکلیس-Empedocle نووسراون، ئەمانەش کۆمەڵێک بوار دەگرنەوە، وەک: شیعری فەلەکی (ئەستێرە ناسی) شیعری کەشناسی: (وەک پێشبینیەکانی ئاراتۆس- Aratos.) ئەمە وەک سەرەتایەک، بەڵام لە شیعری لاتینی شاکاری گەورەی شیعری تەعلیمی هەیە و دەتوانرێ لەم ڕووەوە، بەسەردەمی زێڕینی ئەم جۆرە شیعرە دابنرێ. وەک نموونەی شیعری لۆکرێس- Lucrece، (De natura rerum) کە تایبەتە بەپێشاندانی فەلسەفەی ئێپیکۆرۆس- Epicure. شیعری Georgique-ی ڤیرژیل، کە تایبەتە بەکێڵان و کشتوکاڵ و پیت و بەرەکەتی زەوی. هونەری شیعر-ی هۆراس و هونەری خۆشەویستیی ئۆڤید- Ovide. نموونەی دیکە لەم

بارەیەوە زۆرە، ئەمەش تا دوای سەدەکانی ناوەڕاست درێژە دەکێشێ، لە سەردەمی لاتینی نوێ- نموونەی لەم جۆرە شیعرە زۆرە، دوای شیعرە زانستییەکانی پیلۆتییێ دو مانس- Peletier de Mans و چیرۆکەکانی لافۆنتێن و هونەری شیعر-ی بوالۆ- Boileau، شیعری تەعلیمی لە سەدەی هەژدەیەم بەرگێکی دیکە لەبەر دەکاو نوێ بوونەوەیەکی دیکە بەخۆیەوە دەبینێ. لێرەش نموونەمان زۆرە، وەک شیعری (ئاخاوتنێک لە بارەی مرۆڤەوە- قەسیدەیەک لە بارەی کارەساتی لیشبۆن)ی ڤۆلتێر. وەرزەکان-ی Les Saisons-ی سان لامبێرت- Saint- Lambert، مانگەکان- Les mois-ی ڕووشێ- Roucher... هتد.

لە مێژووی ئەدەبی ئەوروپی وای بۆ دەچوون کە شۆڕشی ڕۆمانتیزم کۆتایی بەشیعری تەعلیمی هێناوە، بەڵام لە ڕاستیدا، کۆتایی پێ هێنان و دەرکردنی بڕیاری مەرگی شیعری تەعلیمی دەگەڕێتەوە بۆ بۆدلێر- Baudlaire کە لایەنی فێرکردن و زانستی لە شیعر بەکفر و ئەفسانە لە قەڵەم دەدا. لەم ڕووەوە بۆدلێر دەڵێ: (شیعر ناتوانێ لاسایی زانست بکاتەوە، ئەگەر ئەمە بکا، خۆی فەرمانی مەرگ بۆ خۆی دەردەکا، شیعر سەر بەحەقیقەت نییە و شتێکی لەم جۆرەشی هەڵنەگرتووە، شیعر تەنیا سەر بەخۆیەتی.)

لە ئەدەبی کوردیدا، شیعری تەعلیمی مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە، ئەمەش بەپلەی یەکەم سەدەی نۆزدەو سەدەی بیستەم دەگرێتەوە. نموونەش لەم ڕووەوە زۆرە، وەک: مەولوودنامە کوردییەکان، عەقیدە نامەکان، سروودەکان، شیعری تایبەت بەمنداڵان، پارچە شیعری دیکەی شاعیرانی وەک پیرەمێرد و دڵدار و گۆران و هەژار، دەشێ ببنە نموونەی جوانی شیعری تەعلیمی.

## شیعری وەسفی Poesie Descriptive

وەسف وەک دیاردەیەکی ئەدەبی، دەشێ لەناو هەموو جۆرە شیعرێک بدۆزریتەوە، هەڵبەت ئەمەش مێژوویەکی ئاڵۆزی هەیە، ئامانجی سەرەکیش ڕازاندنەوەی ئەو بەرهەمە ئەدەبییە بووە. نموونەی نایاب لەم ڕووەوە زۆرە، وەک: وەسفی زرێی ئاشیل لە ئیلیادە. ئەم جۆرە شیعرە، لە هەندێ سەردەم، بەتایبەتی لە سەردەمی لاتین و ڕۆمانەکان، ژانرێکی ئەدەبی سەربەخۆ بوو. لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەیەم، دەبینین بەکاریگەری شاعیری ئیتالی مارینۆ- Marino، هەندێ لە شاعیرانی فەرەنسی وەسفی ورد و ئاڵۆز پێشکەش دەکەن، وەک: سان ئەمان- Saint- Amant-ی نووسەری کتێبی (موسای ڕزگار بوو) کە دواتر دەبێتە بابەتی گاڵتە پێکردن و هێرشی بوالۆ-ی ڕەخنەگر. یان (دەریای تریستان)ی هێرمیت- Hermit کە بەکارێکی سەرکەوتوو و جوان ناسراوە، بەڵام شیعری وەسفی، هەروەکو شیعری تەعلیمی لە سەدەی حەڤدەیەمەوە، بەتایبەتی لە کۆتاییەکەی، نوێبوونەوە و دەوڵەمەندی بەخۆیەوە دەبینێ، ئەم دوو لایەنەش، تەعلیمی و وەسف هەندێ جار، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا تێکەڵی یەکتر دەبن و دەتوانین بڵێین یەک مێژوویان هەیە، بۆ نموونە هەر لەم سەردەمەوە، ماری ژۆزێف شینیێ هەروەکو بوالۆ دژی زیادە ڕۆیی و درێژدادڕی لە وەسف کردن دەوەستێ، ئەمەش لە شیعری (خیتابێکی شیعری لەمەڕ شیعری وەسفی) پێشان دراوە. هەر لەم سەردەمەدا یەکێکی دیکە وەک:Delille- دێلیل، لاسایی ڤیرژیل دەکاتەوە، چونکە تا ئەو سەردەمەش وەسفەکانی ڤیرژیل بەنموونەی هەرە باڵا لە قەڵەم دەدرا. لەناو ئەدەبی فەرەنسی دێلیل بەکارەکانی وەک: باخچەکان- homme de) champs ou les georgique, Les jardias) پیاوی کیڵگە یان ژیۆرژیکی فەرەنسی. Francais (ژیۆرژیک- جۆرە شیعرێکی فەرەنسی-یە) و هەرسێ لە دایکبوونەکانی سروشت- Les trois regnes de la nature... هتد، بەنموونەی جوانی شیعری تەعلیمی و وەسفی سروشت ناسراوە.

کافکا

ئەگەرچی شۆڕشی ڕۆمانسی سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم کاریگەری لەسەر شیعری وەسفی هەبوو، لەگەڵ ئەمەشدا وەک لایەنی تەعلیمی ڕاستەوخۆ نامرێ و لەناو ناچێ، بەڵکو بەشێوە و شێوازی دیکە لە لای شاعیران و نووسەرانی سەدەی نۆزدەیەم درێژە بەخۆی دەدا. وەک هوگۆ، بۆدلێر، لە شیعر و پەخشانەکانی، فلۆبێر و کلۆدێل و دواتر لە لای ڤالێری. بەلام لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕۆمانی نوێ، پێوەندییە ئەدەبییەکان هەڵکەوتێکی دیکە بەخۆیانەوە دەبینن.

شەپۆلی ڕۆمانی نوێ بەسەر وەسفدا زاڵ دەبێ و دەیکاتە چەکێک دژی ئیستێتیکی ڕۆمانسی کۆن. دەکرێ ئەمەش بەدەستنیشانکردنی بەهایەکی دیکەی ئەدەبی دابنرێ کە بەدوای فۆرمی شیعری خۆیدا دەگەڕێ. بەهەمان شێوەی سەرەوەی، لایەنی وەسف دەکرێ لە شیعری کوردی پێشان بدرێ و هەڵکەوت و سروشتی دیاری بکرێ. وەسف وەک دیاردەیەک یان شیعری وەسفی لە ئەدەبیاتی کوردی نموونەی زۆرە.

## سوریالیزم Surrealisme

سوریالیزم بزووتنەوەیەکی هونەری بوو کە لەنێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی گەشەی کرد، ئەمەش بەپلەی یەکەم لەژێر سەرپەرشتی ئەندرێ برۆتۆن بوو – Andre Breton. سوریالیزم لەناو سکی داداییزم دەرهاتووە، دەتوانین بلێین پاشماوەی ئەوە. دەتوانین بلێین سوریالیزم بریتییە لە توانینی تەعبیر کردن و بیرکردنەوە لە دەرەوەی چوارچێوەی کۆنترۆڵ کردنی ئاوەزو ئەقڵ. ئەمەش خەیاڵمان ڕاستەوخۆ بۆ نووسینی ئۆتۆماتیکی دەباتەوە. ڕیزکردن و یەک بەدوای یەک هاتنی وێنەی

پێکنەچوو و هەندێ جاریش چرووک، بریتین لە کەرەستەی ئەم جۆرە نووسینە.

سەرەتا ئیشارەمان بەدادائیزم کرد، دادا - Dada؛ وشەیەکە لەلایەن چەند شاعیر و نووسەرەوە داهێنراوە کە لە زیورخ لە ساڵی ١٩١٦ کۆبوونەوە، لە کاتێکدا بەربەرییەتی جەنگی یەکەمی جیهانی لە نرخی هەموو شتێکی کەم کردبۆوە. لەناوبردن و پرۆتێستۆ و تێکدان وەک پەیامێکی تازەی ئەو بزووتنەوەیە بوو کە هەموو شتێکیان ڕەفز دەکردەوە، تا خودی داهێنانی ئەدەبی و فیکری... هتد. دادا بەسەرۆکایەتیی تریستان چارا - Tristan Tzara سەری هەڵدا. ئەم گرووپە شاعیر و نووسەرانە، زمانی شیعریان هەڵدەگێڕاوە و تێکەڵوپێکەڵیان دەکردن، تابلۆیان بەکۆلاژ لە ڕێگای تێکەڵاو کردنی کۆمەڵێک ماددەوە دروست دەکرد. وشەی سەرەکیی ئەم گرووپە: داهێنان - (إختراع = Invention) و ئازادی = Li- berte بوون. ئەوەی بەلایان گرینگ بوو ئاودیوی ئەودیوی سنووری ماقوولییەت بن. دادائیزم تێکشکان و وروژاندن و هاندان (بەمانا نێگەتیڤەکەی) ڕەفز ناکاتەوە.

ئەمان بەتوندی دژی حەقیقەت و ماقوولییەت بوون و گاڵتەیان بەحەقیقەت و دروستی دەهات. سەرەنجام لەناو ئەم ئاووهەوا هونەری و فیکرییەدا سوریالیزم لە دایک بوو.

وشەی سوریالیزم، وەک دەستەواژەیەکی هونەری و ئەدەبی، دەگەڕێتەوە بۆ داهێنانی شاعیر ئەپۆلینێر - Apollinaire، بەڵام وەک پێناسە نووسین لەبارەیەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەندرێ برۆتۆن ١٩٢٤، ئەمەش وەک نووسینێکی ئۆتۆماتیکی لەلایەن ئەقڵ کۆنترۆڵ نەکرێ. لەپاڵ ئەم پێناسەیەدا دەشێ خاسییەتەکان و بچمەکانی سوریالیزم بخەینە ڕوو. درێژەدان بەڕوانین و هەڵوێستەکانی دادائیزم، سوریالیزم پشتگیری لە شۆڕش دەکا بەپێچەوانەوە، دژی بیری ئایدیالی و دەست گرتن بەخوو و نەریتی باو (= Conformisme)، بەدوای واقیع و پێوەندیی نوێ

دەگەڕێ، هەروەک چۆن پۆل ئێلوار - P. Eluard دەڵێ: (نامەکە هەروەک پرتەقاڵ شینە) ئەمەیان کۆکردنەوە و لەپاڵ یەکتردانانی چەند وێنەو چەمکێکە کە هیچ لۆژیکێک کۆیان ناکاتەوە. بەهەمان شێوە، ڕۆبێرت دێزنۆس دەڵێ:

(لە پۆستەخانەی دوێنێ نامەکەت لە ئایندە دەنێری. ئای کە ئێمە چاک لەگەڵ باڵندەکان مردووین. پۆستەچی خەمبار، پۆستەچی تابووتێکە لەبن باڵت بڕۆ نامەکەم بەشەقەی باڵ(١) بۆ گوڵەکان ببە). یاری کردن لەگەڵ زەمەن و ماناکانی زەمەن: (ئایندە، ئەو ڕابردووەی لە ئێستادا درێژەی هەیە، بەڵام تەنیا لەلایەن ئێمەوە تەعبیری لێ دەکرێ، ئەمەش لەبەر مەسەلەی مەرگ). یاری کردن لەگەڵ وشە یەکێکە لە خاسییەتەکانی سوریالیزم. وەک ئەم نموونەیەی سەرەوە کە دێزنۆس بۆ (شەقەی باڵ - Tire d'ailes) نووسیویەتی (شەقەی کچ - Tire d'elle) کە هەردووکیان وەک یەک دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەمەی دوایی وێنەی فڕینی مرۆڤێکمان دەداتێ.

خەون و نائاگایی و ئەندێشە بۆ سوریالیستەکان. بریتییە لە کانگای وێنەو خەیاڵ کە لە ڕێگای کۆمەڵێک شێوازی نووسین و تەکنیک تەعبیری لێ دەکرێ. ڕێگادان بەقەڵەم لە کاتی زیندە خەوی و نیوە هوشیاری بۆ خۆی بجووڵێتەوە شێوازێکە لە کۆنترۆڵ نەکردنی بیرکردنەوە و ئازادکردنی توانا شاراوە و چاوەڕوان نەکراوەکانە. مەبەستی سەرەکیی نووسینی ئۆتۆماتیکی پێشاندانی توانا فیکرییەکانە بێ ئەوەی ئەقڵ بتوانێ کۆنترۆڵی هەبێ. مەسەلەکە بریتییە لە نووسینی تێکستێک یان مۆنۆلۆگێک بەخێراییەکی زۆر، دواتر گشت پرەنسیپێکی ڕەخنەیی لەبەرامبەری دۆش دامێنێ. بێجگە لەم جۆرە نووسینە، هەندێ تەکنیکی دیکەش هەن کە وەک یارییەکی نووسین خۆیان ڕەپێش دەکەن، وەک نووسینی بەشێکی ڕستە لەسەر لاپەڕەیەک بەنۆرە لەلایەن چەند کەسانێک بێ و بچێ. هەرکەسە ڕستەی پێشووی خۆی تەواو دەکا بێ ئەوەی بزانێ

ئەوەی پێشوو چیی نووسیوە. یەکەم جار کە سوریالیستەکان بەم جۆرە دەستیان بەنووسین کرد، یەکەم کەس ڕستەی (تەرمی بەتام - Cadavre exquis)ی بەکارهێنا، لەوساوە ڕستەی ئەم جۆرە نووسینە. سوریالیزم دەیەوێ بەکەمترین ڕادەی بەکارهێنانی ئەقڵ و بیرکردنەوەی ئەقڵی، چالاکی و داهێنانی مرۆڤ بدۆزێتەوە و وەبەری بهێنێ. لەناو بزووتنەوەی سوریالیزم ئەم شاعیر و نووسەر و هونەرمەندانە هەبوون: دێزنۆس، ئاراگۆن، ئێلوار، ماکس ژاکۆب، کۆکتۆ، میشۆ، دالی، ماکس ئەرنست، دو شیریکۆ، مارگریت، بەرهەمی ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە تێکەڵاوییەک لە خەون و واقیع، وێنەی زۆر دوور لە واقیع. لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئیلتیزامی سیاسی، هەروەها باوەڕنەهێنان بەخۆ قەتیس کردن لەناو مانیفێستێک ساڵی ١٩٣٥ هەڵدەوەشێتەوە، بەتایبەتی ئەوکاتەی دووچاری ناکۆکی دەبێ لەگەڵ کۆمۆنیزم. سوریالیزم تا دوای جەنگیش درێژەی بەخۆی داو کاریگەری لەسەر هەندێ ڕۆماننووس هەبوو. پاشان بزربوو.

## ڕیالیزم و ناتورالیزم Realisme et Naturalisme

لە ئەدەبیات و ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوادا نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم بەگەلێک بزووتنەوەو ڕێبازی ئەدەبی و فیکری ناسراوە، ڕیالیزم و ناتورالیزم-یش بەشێکن لەو بزووتنەوانە کە تەعبیر لە ڕوانین و ڕەنگدانەوەیەکی سۆسیۆلۆژی و زانستی دەکەن.

ڕیالیزم- Realisme وەک تێرمێکی ئەدەبی ڕەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (Reel) کە بەمانای (حەقیقی، واقیعی، دروست و ڕاستەقینە) دێ. ڕیالیزم وەک بزووتنەوەیەکی ئەدەبی، ساڵی ١٨٥٠ سەری هەڵداوە و لێرە بەدواوە گەشە دەکاو دەوڵەمەندتر دەبێ. ئەم سەرهەڵدان و لە دایک بوونەش لەسەر دەستی هەندێک نیگارکێش و ڕۆماننووس بوو کە هەوڵی ئەوەیان دەدا واقیع و ژیانی دەرەوە، وەکو خۆی بێ دەسکاری پێشان بدەن.

بێگومـان وەک ڕوانینی فـیکری شـتـێکی زۆر ئەسـتـەمە سـەرەتاکـانی بدۆزرێـتـەوە، بەهەمـان شـێـوە وەک ڕوانـینی ئەدەبیش، لە دایکبـوون و سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئەم مێژووەی سەرەوە. وەک تـێرمـێک لە سـاڵانی ١٨٣٥ تا ١٨٤٠ سـەری هەڵداوە و دواتر لە لایەن ڕەخنەگـران بەکـارهاتووە. بۆ نموونە هەر لەم سـاڵانـە لە تابلۆکـانی نیگارکـێـشی فـەرەنسی، کـوربێ- Courbet هەست بەو ڕوانینە دەکرێ؛ بەتـایبـەتی کـە ناومالی دێهاتییەکانی دەکێشاو وەکو خۆی دەیگواستەوە سەر خامەک.

هەڵبـەت ئەم ڕوانـینە، هەر تـەنیـا بـۆچوونێک نەبووە لە خـۆیەوە و دوورەپەرێز لە کاریگەریی دەرەکی و ناوەکی لە دایک بووبێ، بەڵکو وەک بزووتنەوەیەک پێوەندیی بەتەواوی ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتی و دەروونییانەی ئەو سـەردەمەوە هەیە کـە وەک پێکهاتوویەکی ڕۆشنبـیری- کۆمـەڵایەتی- سیاسی-یە.

بۆ نموونە وەک: شـۆڕشی پیـشـەسـازی. ئەو کـاریگەری و ئەو ڕۆڵەی پرۆلیتـاریای تازە گەشەسەندوو هەیبووە، سەرچاوەیەکی نوێی سرووش و بیـرکـردنەوەی هونەرمـەندان بووە. گـەشـەسـەندنی زانست و داهێنانی فۆتۆگراف کە وەک کۆپی کردنێکی تەواوی واقیع و جیهـانی دەرەوە بوو، هەموو ئەمانە کاریگەریی خۆیان هەبوو لەکاتی شۆڕشی پیشەسازیی ساڵی ١٨٤٨، کە کۆتایی بەوەهم و خەیاڵی ڕۆمانسی هێنا.

خاسییەتەکانی ڕیالیزم بریتییە لە تێبینی کردنی جیهـانی هاوچەرخ، جیهانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی؛ کەرەستەکان بریتین لە خەڵک و شتەکان و پێـوەندییـەکـان کـە تا ئەو سـەردەمـە کـەرەسـتـەی کـاری هونـەری نەبوون. سـاڵی ١٨٣٥ بەلزاک- Balzac لە ڕۆمـانی گـۆریـۆ-ی باوک: وەسـفی ژوورێکمـان بۆ دەکا کـە پیسـەو هێڵنج و ڕشانەوە دێنێ. لێـرەوە بەدواوە، نیگارکێشەکان و ئەدیبەکان، ڕوو لەو خەڵک و جیهانە دەکەن کە ژیانێکی ناچیزەو هەژاریان هەیە وەک: کارگەر، هونەرمەند، سۆزانی، ڕەشوڕووت، ئەمـانە لە چوارچێوەی وێنەیەکی زۆر بێ ماناو ناچیزە پێشکەش کـراون،

یان ئەم وێنەیە پێشکەش بەخوێنەر دەکەن. بۆ نموونە: فلۆبێر- Flaubert بەدیمەنێک باسی تالان کردنێک دەکا و بێ هیچ ڕوالەتێکی ڕۆمانسی یان شیعرییەت.

خەڵکەکە بەگیانەوەرێکی بەستراوە دەچوێنێ زنجیری پساندبێ. نووسەرانی ڕیالیست دەیانویست نەک هەر تەنیا وەک تێبینی کردنێک لاسایی حەقیقەت و واقیع بکەنەوە، بەڵکو دەیانویست ئەم لاسایی کردنەوە ئەوەندە ڕێک و وردبێ وەک دۆکیمەنتێک خۆی نیشان بدا. گۆنکوور و زۆلا دەچوون ڕاستەوخۆ بۆ بینینی کێشەکان بەچاوی خۆیان و کەرەستەیان کۆدەکردەوەو لەلای پسپۆران زانیارییان وەردەگرت. هەرچی مۆپاسان و فلۆبێر بوون تێکەڵاوی ناوەندە پزیشکییەکان دەبوون بۆ کۆکردنەوەی زانیاری. ئەم ڕوانینە وردە بۆ حەقیقەت و واقیع لەلای نووسەران و هونەرمەندان، تاڕادەیەک لە نرخی سایکۆلۆژیی تاکەکەسی کەم کردبۆوە و زیاتر تاکەکەسی سۆسیۆلۆژیی دەنرخاند. هەر لەم ڕوانگەشەوە ناتورالیزم لە دایک دەبێ و گرینگی بەواقیعی مرۆڤ دەدا وەک ئەوەی لە ڕیالیزم زانستیتر و دروستتر بێ.

زۆلا- Zola، ناتورالیزم وەک فۆرمولێکی زانستیی هاوچەرخ دەناسێنێ کە لەسەر ئەدەب پەیرەو کرابێ، یان بەئەدەب و زمانی ئەدەب پەیرەو بکرێ. لەبەر ئەوە دەبێ لەناو زانستەوە بۆی بگەڕێی: دوو دیاردە یان دوو بابەت لە بنچینەی سەرهەڵدانی ناتورالیزمدان، وەک: ڕۆمانی ئەزموونی و مێژووی سروشتی و کۆمەڵایەتی خێزانێکی فەرەنسی لەسەردەمی ئیمپراتۆریای دووەم. ئەو تێرمانەی بۆ دەستنیشان کردنی ناوەرۆکێکی ناتورالیزمی بەکارهاتوون، خزمایەتیی زۆریان لەگەڵ بواری زانستی ڕووت-ەوە هەیە. وەک: مێتۆدی ئەزموونگەری- Methode ex-perimentale-ی بێرنارد- C. Bernard، کە مۆد و ئەقڵی مەنتیقی و زانستی بەکاردێنێ. ناسینەوەو پۆلێن کردنی ئەنجامەکانی ئەزموونگەری، تێبینی کردنی کردەکان، بەکارهێنانی ئەزموون و تاقیکردنەوەی دیکە بۆ

ئارتور میللەر

پشكنینی گریمانەكان، بوونی ڕوانگەیەكی مەوزووعی. زۆلا دەڵێ ڕۆماننووس بریتییە لە كەسێك كە بەچاوێكی ئەزموونگەری تێبینی دەكا و نوێنەری یان نوێنەرایەتیی ڕوانین و ئاوەزێكی پۆزیتیڤیزمی-یانە دەكا. (وضعی- Positiviste)
لێرەوە ڕیالیزم وەك كۆپی كردنێكی واقیع و دۆكیمەنتی، شوێنی خۆی بۆ ئەزموون و ئەزموونگەری چۆڵ دەكا. ڕۆماننووس بۆ خۆی پێوەندییەك و حاڵەتێك دروست دەكا، كەسایەتییەك بەپاشخانێكی گرانی كۆمەڵایەتی لە ناوەندێكی تایبەتی وەك: كرێكار، دیپلۆماسی، پسپۆرانی دارایی... هتد) دیار دەكا یان دەستنیشان دەكا. نووسەر ڕێگا بەخۆی دەدا تێبینی و شیكردنەوەی هەبێ بۆ پاڵەوانەكانی، هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی مەوزووعییەتێكی زانستی.

لێرەوە هەموو ڕۆمانێك وەك ئەزموونێكی نوێ خۆیان نیشان دەدەن. لەگەڵ ئەمەش دەبێ بڵێین ئەدەب و زانست دوو شتن بەزەحمەت لە ئاستی یەكترو هاوتای یەكترن.

بێگومان ڕیالیزم و ناتورالیزم، سنووری دیاری كراو و تەمومژی خۆی هەیە. بۆ نموونە: مۆپاسان لەگەڵ ئەو ڕایەدایە كە ڕۆماننووس قەت ناتوانێ تەواوی تەفاسیل و وردەكاریی واقیع پێشان بدا. لەلایەكی دیكە ڕۆماننووسین، دیاردەیەكی هونەری وەك- داهێنانی شێوازی هونەری- ڕەپێش دەكا- لێرەشەوە بەپلەی یەكەم لایەنی زاتیی نووسەر بەدیار دەخا، یان ژیانی زاتیی نووسەر دەستنیشان دەكا. بێجگە لەمەش خاڵێكی دیكەی زۆر گرینگ كە بەزانست كۆنترۆڵ ناكرێ و وەك بوون لەگەڵ یەكتری ناگونجێن، ئەوەیە: مرۆڤ بریتییە لە بیر و عاتیفە و ڕوانین چەشە

و ئارەزوو... هتد، هەموو ئەمانە ناکەونە بەر پێوانی زانستی، سەرەنجام مرۆڤ ڕۆبۆت نییە بەپرۆگرام بجوولێتەوە. لەبەر ئەوە گونجاو نییە کاردانەوە و خەیاڵێکی ئەدەبی وەک زانست وەربگیردرێ.

### ترازێدی TRAGEDIE

ترازێدی کە لەناو ڕۆشنبیریی کوردی تا ئێستا بە(مەرگەسات و کارەسات) وەرگێڕدراوە و لەم ڕووەوە سوود لە هاوتا عەرەبییەکەی (مأساه) وەرگیراوە. لەم دوو ناولێنانە تارادەیەک یەکەمیان لەو مانایە نزیکە کە ترازێدی وەک دەستەواژەیەکی ئەدەبی و ژانرێکی ئەدەبی هەیەتی، بەڵام هی دووەم (کارەسات) بەهیچ شێوەیەک ئەو مانایە نادا، ڕەنگە کارەسات زیاتر مانای درام (Drame- ڕووداو)یان (کارەسات- Tragique) نزیک بێ کە لە دەرەوەی ترازێدی وەک ماهیەتێک و ژانرێکی ئەدەبی، لەناو هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی، کۆن و نوێ، دەدۆزرێتەوە.

ئێمە زۆر بەگونجاو و چاکی دەزانین، زاراوەی ترازێدی وەک خۆی بەئاوازە لاتینییەکەی وەربگرین و بەم چەشنەش بەکاری بهێنین.

ترازێدی لە سەدەی شەشەمی پێش زایین لە یۆنان سەری هەڵداوە، بەڵام وەک فۆرمێکی ئەدەبی پڕو تەواو ئەم سەرهەڵدانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی پێش زایین و بەتایبەتیش بۆ شاری ئاتینا. ئەو کارە ئەدەبییانەی کە لەو سەردەمە بۆمان ماوەتەوە و لەلایەن یۆنانییەکان پارێزراوە، نزیکەی سی و دوو پیەسە لەسەر نزیکەی پێنج سەد پیەسی دیکە. لە مێژووی ترازێدی، ئەم سەردەمە بەسەردەمی گەورەی شاعیرانی مەزنی ترازێدی ناسراوە. ئەم بەرهەمانەش کە ماونەتەوە، هی شاعیرانی ئێشیل- Eshyle و سۆفۆکلیس- Sophocle و ئورپیدۆس- Euripide-ن. ئەم سەرهەڵدانە لە مێژووی یۆنان بەوەرچەرخانێکی زۆر خێرا و بەهێز ناسراوە، هەر لەبەر ئەوەش، لێکۆڵەرەوەکان، تەواوی ماددەی لە دایکبوونی ترازێدی دەگەڕێننەوە بۆ ئەم سەردەمە و لەمە زیاتر بەناو مێژوودا شۆڕنابنەوە بۆ گەڕان بەدوای ڕیشاڵ و وردەکاریی دیکە.

ئەم وەرچەرخانە کۆمەڵێک لێکدانەوە هەڵدەگرێ، بەو مانایەی وەرچەرخانێکی سایکۆ- سۆسیۆلۆژی بووە لە ژیانی یۆنانییەکان، هەروەها وەرچەرخانێکیش بووە لە فۆرمە ئەدەبییەکان و تاقیکردنەوە مرۆڤایەتییەکان: وەک لە دایکبوونی ژانرێکی نوێی ئەدەبی و لە دایکبوونی هۆشیاری تراژێدی.

لە دایکبوونی تراژێدی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جەژنانەی کە یۆنانییە کۆنەکان وەک نەریتێک هەموو ساڵێک بۆ ستایش و لە شەرافەتی خوداوەند دیۆنیزۆس- Dionysos بەرپایان دەکرد. ئەمەش لە شێوەی کۆڕاڵ و شانۆیەکی کراوە بوو تێیدا کۆمەڵێک دیمەنی تراژێدی و کۆمێدی دەگرتە خۆی. بەگشتی لە شانۆیەکی نیوەبازنەیی و والا دیمە تراژێدییەکان پێشکەش دەکران. پاڵەوانەکان، جلوبەرگی قورس و گەورەی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر دەکرد و ماسک و پێڵاوی بەرزیان لەپێ دەکرد، هەموو ئەمانە دیمەنێکی سەرەنج ڕاکێش و هەست بزوێنیان دروست دەکرد.

وەک نوێ بوونەوەیەک، شاعیرانی مەزنی تراژێدیی یۆنانی سوودیان لە داستانسەرا (ملحمە- Epope) مەزنەکان و پاڵەوانە داستانسەراییە مەزنەکان و شیعری لیریکی و هۆنراوەی داستانسەرایی (قصیدە ملحمیە- Geste) و میتۆلۆژیای یۆنانی کۆن و بابەتە ئایینییەکان وەرگرتووە. وەک: ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤ لەگەڵ ئەو هێزانەی کە لە سەرەوەی خۆی بوونە، وەک: سروشت، خوداکان، پیاوە دەستەڵاتدارەکان.

بۆ نموونە، پاڵەوانی وەک ئۆدیپ- Oedipe و ئۆرێست- Oreste، نموونەی بەرجەستەکردنی ئەو کێشانەن کە بەرپرسیاری ئادەمیزاد بەرامبەر بەچارەنووس و قەدەر (Fatalite)یان هەڵگەڕانەوە یان سەردانەواندنیان بەرامبەر بەئیرادەی خوداکان پێشان دەدەن و دەردەبڕن. ئەنتیگۆن-ی سۆفۆکلیس، خەبات لە پێناوی عەدالەت دەردەبڕێ.

لەناو ئەم پێوەندییە، تراژێدی وەک زمانێکی دیکەی نوێی ئەدەبی، یان فۆرم و ژانرێکی نوێی ئەدەبی لە دایک دەبێ کە دواتر لەلایەن شاعیرە

مەزنە تراژێدییەکان ڕوونتر و پوختەتر لە شێوەی شانۆگەریی نووسراو پێشکەش دەکرێ.

لە سەردەمی کلاسیک، بەتایبەتی لە سەدەی حەڤدە و کەمێکیش پێشتر، بەتایبەتی لە فەرەنسا، جارێکی دیکە تراژێدی بەهەمان ڕیتم و بەهەمان هێز و هوروژمی سەردەمی لە دایکبوونی سەرهەڵدەداتەوە، شاعیرانی ئەو سەردەمە، لە ئەنجامی ئەو خۆشەویستی و هەستەی بەرامبەر بەو سەردەمە هەیانبوو (سەردەمی کۆنی یۆنانی) تەواوی کارە ئەدەبییەکانیان بەو سرووش و ئیلهامەوە نووسیوە و ناوەرۆکی کارە تراژێدییەکانیان لە مێژووی کۆنی یۆنان و ڕۆمانەکان وەرگرتووە. وەک کارەکانی کۆرنێی- Corneille و ڕاسین- Racine، یان ئەو تێمانەی «بابەت» پێوەندییان بەڕاپەڕینەوە هەبووە، بڕوانە هۆراس- Horace، یان ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی نەیار، بڕوانە: ئەندرۆماک- Andromaque و بێرێنیس- Berenice، یان مەسەلەیەکی وەک چارەنووس، بڕوانە فێدر- phedre. شاعیرانی ئەو سەردەمە بەهەمان شێوەی کۆن، خاسییەتی مەراسیمی و کۆڕالی-یان لە کارەکانیان پاراستبوو و گرینگییان بەکردەو ڕووداوێکی سادە و دیار و مەزن دەدا و هەموو ئەمانەش لە چوارچێوەی زمانێکی شاعیرانە و پایە بلند.

خاسییەتە هونەرییەکانی ناوەوەی تراژێدی، بەتایبەتی هی سەردەمی کلاسیک، بریتییە لە زۆر شت، وەک: ژانرێکی ئەدەبی پایە بلند- No-ble، بوونی ڕێسایەکی تایبەتیی بەخۆی، وەک: دەبێ بەشیعر بنووسرێ، بەزمانێکی نایاب و لە پێنج بەش پێک بێ. بەشی یەکەم تایبەتە بەپێشکەش کردن یان چوونە ناو بابەت. بەشی دووەم و سێیەم و چوارەم تایبەتە بەگەشەسەندن و فراوان بوونی ڕووداو. دەشێ ناو لە بەشی پێنجەم بنێین چرکەی دراماتیکی کە تێیدا ڕووداو دەگاتە چلەپۆپە. هەر لەم بەشەش خاتیمەیەک هەیە کە دەبێ بەمەرگ کۆتایی بەهەموو شتێک بهێنێ.

پاڵەوانەکان دەبێ لە چینی سەرەوەی کۆمەڵ دەرهاتبن، وەک: پاڵەوانی ئەفسانەیی، شاو میرو بەگزادەکان.

ڕووداو دەبێ لە ڕابردوو بێ و سەردەمی ئەفسانەکان یان مێژووی کۆن، یان ڕووداو و مێژووی ناو کتێبە ئایینییەکان وەک: تەورات، بگێڕێتەوە. لە تەکنیکی نووسین دەبێ پەیڕەوی ڕێسای: (Regle des trois Unites) بکرێ.

واتە: وەخت و شوێن و ڕووداو، هەموو ئەمانە دەبێ یەکگرتووبن و تێک بکەنەوەو هارمۆنی لە نێوانیان هەبێ.

وەک بیست و چوار سەعات یان زیاتر لەناو کۆشکێک و یەک ڕووداویش. ئەم ڕێسایە خەستی و چڕییەکی دراماتیکی پێشکەش دەکەن. گشت ئەمانەش دەبێ بەدیالۆگ جێبەجێ بکرێن، هەرچی دیمەنی جەنگ و کوشتن و مردن-ە، نابێ بخرێنە سەر شانۆ، بەڵکو دەبێ بگێڕدرێنەوە.

بەڕای ئەریستۆ- Aristote (سەدەی ٤پ.ز.) تراژێدی دەبێ هەستی تۆقین و شەفەقەی ئادەمیزاد بجووڵێنێ. ئامانجی ئەمەش کاتارسیس-ە، کە پاککردنەوەی عاتیفەیە. دیمەنی ئەشکەنجەو بەدبەختیی پاڵەوان بینەر بەناو هەستی تۆقین و شەفەقەدا دەباو سەرەنجام وای لێدەکات خۆی لە عاتیفەو هەمان هەست ئازاد بکاو ڕزگاری بێ. ئەمەش بەگوێرەی ئەریستۆ یەکەم وەزیفەی تراژێدییە.

بێجگە لەم دوو هەستە، کۆرنێی هەستی ئیعجاب- Admiration-یشی بۆ زیاد دەکا. هەندێ جار پاڵەوانی ئەو وەک مۆدێلێک وەردەگیرێ، بەڵام لە تراژێدی ڕاسین، زیاتر هەستێکی تراژێدی ڕەشبینانە بۆ چارەنووسی یان قەدەری مرۆڤ هەستی پێدەکرێ، ئەمەش بەو مانایەی پاڵەوانەکانی ڕاسین زیاتر قوربانیی دەستی خۆیانن.

لە سەدەی هەژدەم ڤۆلتێر لە ئەنجامی خۆشەویستی زۆری بۆ ڕاسین، کۆمەڵێک تراژێدی نووسی، بەڵام لە سەدەی نۆزدەم تراژێدی لەلایەن

ڕۆمانتیکەکان ڕەفز دەکرێتەوە، لەم بێ ماناکردنەش، ڤیکتۆر هوگۆ -.V Hugo دەستێکی باڵای هەبوو.

لە سەدەی بیستەم تراژێدی وەک ژانرێکی ئەدەبی بزر دەبێ و نامێنێ، بەڵام تراژێدی وەک هەستێکی دراماتیکی، یان هەستی تراژێدی- -Tra gique درێژە بەخۆی دەدا، ئەمەش تارادەیەک لە گشت جۆرە ئەدەبێک دەدۆزرێتەوە، شانۆش هەردەم گونجاوترین شوێنی تەعبیر لێ کردنی بووە. ئەو بابەتە نوێیانەی کە هەستی تراژێدی Tragique نوێ بەتراژێدی Tragedie کۆن دەبەستێتەوە، لە ئەدەبی هاوچەرخ زۆرە، وەک: ئازادی، شۆڕش و ڕاپەڕینەکان، کەسایەتییەکان، تەنیایی و قەدەری مرۆڤ، وەک بۆ نموونە لە کارەکانی سامۆییل بێکێت- Beckett.

لەناو ئەدەبی کوردی-یش، دەشێ مەم و زین-ی ئەحمەدی خانی و شیرین و خوسرەو-ی خانای قوبادی، وێڕای هەندێ داستانی دیکەو بەیتی دیکەی فۆلکلۆری بەتراژێدی لە قەڵەم بدەین، یان ئەم ناوەرۆکەی سەرەوەیان تێدا بدۆزینەوە.

**ئومبێرتۆ ئیکۆ** Umberto ECO

... ئێکۆ لە ساڵی ١٩٣٢ لە شاری ئەلێساندریا لە باکووری ئیتالیا لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩٥٤ خوێندنی باڵای لە شاری تورین تەواو کردووە و هەر لەم ساڵەش تێزێکی لە بارەی (جوانیناسی لەلای یان لە ڕوانگەی سان تۆماس ئەکین- Saint Thomas Aquin)ەوە پێشکەش کردووە. سەرەتا وەک یاریدەدەر و بەردەستێک لە ساڵی (١٩٥٥)ەوە تا ١٩٥٨ لە تەلەفزیۆن کار دەکا و هەر لە ساڵی (١٩٥٦)ەوە بەشداریی لە دەرکردنی گۆڤاری (جوانیناسی- Rivista di estetica) دەکا، پاشان بەڕاسپاردەی دەزگای بڵاوکردنەوەی: Bompiani کتێبێکی وێنەدار لە بارەی مێژووی داهێنانەکان دەنووسێ.

ساڵی ١٩٦٠ دەبێتە بەڕێوەبەری زنجیرە کتێبێکی فەلسەفی.

له ساڵی ١٩٦٣دا لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی گەنج وەک: نانی بالێسترینی- Nani Balestrini و ئەلبێرتۆ ئەرباسینۆ- Alberto Arbasino، بەیەکەوە دەزگای (گرووپی- ٦٣) دادەمەزرێنن. له ساڵی (١٩٦٦)ەوە تا ساڵی ١٩٧٠ له کۆلیژی بیناسازیی دانیشگای فلۆرانس و نیویۆرک و میلان دەرس دەڵێتەوە. له ساڵی ١٩٧١دا کورسیی سێمیۆتیک له دانیشگای بۆلۆن وەردەگرێ. ساڵی ١٩٩٢ دەبێتە خاوەن کورسیی ئەورووپی له (کۆلیژ دو فرانس- College de France)، له هەمان کات بەڕێوەبەرایەتیی (ئەنستیتوی دیسپلینی پەیوەندییەکان- Institut municaxion des disciplines de la com) و سەرۆکایەتیی (کۆمەڵەی جیهانیی لێکۆڵینەوە سێمیۆتیکییەکان International association for semiotic Studies) دەکا.

تاقیکردنەوە بەراییەکانی ئێکۆ له تەلەڤزیۆنی ئیتالی، وایان لێ کرد زوو بکەوێتە ناو بواری (پێوەندییە بەربلاو و فراوانەکان- Communication de mass) و گەلێک فۆرمی دیکەی نوێی تەعبیرکردن و دەربڕین، وەک: زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان و بەرنامە هەمەڕەنگەکان. لەم ماوەیە دۆزینەوە گرینگەکانی بریتین له بایەخدان بەبەرهەمی کاری ئەدەبی و هونەری خراپ و بێ مانا- kitsch و ئەستێرەکانی تەلەفزیۆن، هەندێ لایەنی ژیانی میللیی ئەو سەردەمە کە له کتێبی Appocalittici e integrati کە له ساڵی ١٩٦٣دا چاپکراوە و کتێبی- La guerre du Faux- کە له فەرەنسا له ساڵی ١٩٨٥دا چاپکراوە، کۆکراوەی گوتارەکانی ساڵانی شەستن و کتێبی (له سۆپەرمانەوە بۆ سوپەر مرۆڤ - Du superman au surhomme) کە له ساڵی ١٩٧٨ چاپکراوە.

لێکۆڵینەوەکانی بەرەو ئەوەی دەبەن گرینگی بەو جۆرە ئەدەبییاتە بدا کە بە(ژانرێکی نزم) له ئەدەبیات و ڕۆشنبیری ئەورووپی ناسراون، وەک: ڕۆمانی پۆلیسی، ڕۆمانی زنجیرە تەلەفزیۆنییەکان.

هەوڵی لێکدانەوەیان دەدا وەک پرۆسەیەک و وەک سترەکتورێک،

لەهەمان کات گرینگی بەهەندێ دیاردەی دیکە دەدا کە سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیی هاوچەرخ، وەک: فووتبۆڵ- تۆپانێ، ئەستێرەکانی سینەما و تەلەفزیۆن و مۆد و تیرۆریزم.

ئەگەرچی فزولییەت و بواری پشکنین و لێکۆڵینەوە لەلای ئێکۆ هیچ سنوورێکی نییە، لەگەڵ ئەمەش مەڵبەندی بەرژەوەندی لەم لایەنەوە بەپلەی یەکەم بریتییە لەو ئیرادەیەی کە ئەو (مانا لەو شوێنانە دەبینێ لە کاتێکدا ئێمە سەرەڕای هەوڵدانمان کردەی لێ دەبینین یان وەک کردەیەک دەبینین.) لەم گۆشە نیگایەوە هەوڵی دارشتنی بنەماکانی سێمیۆتیکیی گشتی داوە، کە لەساڵی ١٩٧٥دا وەک کتێبێک بەناوی (سێمیۆتیکی گشتی- Traite de semiotique generale) بڵاودەبێتەوە، لەم ڕێگایەوە هەوڵی ئەوەی داوە گەشە بەجوانیناسی و شیکردنەوە و لێکدانەوەی بدا. ئێکۆ لە کتێبی (بەرهەمی کراوە یان والا- L'oeuvre ouverte) کە لە ساڵی ١٩٦٢دا نووسیویەتی، هەوڵی پێناسەکردنی هونەر دەدا، لێرەوە، لە ڕێگای زنجیرە گوتارێک بەردی بناغەی تیۆرییەکەی خۆی داناوە، کە دەڵێ: هونەر بریتییە لە پەیامێکی ئاڵۆز و پڕ لە تەمومژ. ئەم پەیامە لێکدانەوە و شیکردنەوەی بێ سنوور هەڵدەگرێ لە کاتێکدا دەبینین کۆمەڵێک (مەدلوول- Signifie) لەناو یەک (دەلالەت- Signifiant) جێگای دەبێتەوە. کەواتە تێکست شتێک نییە سنووردار بێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە شتێکە کراوە و والایە و خوێنەر ناتوانێ دڵی خۆی بەوە خۆش بکا شتەکان بێ جووڵە و بزاڤ لەلایەن خۆیەوە وەرگرێ، بەڵکو ناچار دەکرێ، واتە خوێنەر، لەلایەن خۆیەوە هەوڵی داهێنان و شیکردنەوە بدا.

بیرو ڕوانینی بەهێزی ئێکۆ لەم بارەیەوە لە کتێبی (خوێنەری ناو چیرۆک- L'ector in Fabula) کە لە ساڵی ١٩٧٩دا بڵاوی کردۆتەوە، خراوەتە ڕوو: ئێکۆ دەڵێ، تێکست (دەق= نص=Texte) چونکە هەموو شتێک ناڵێ و هەموو مانایەک ناگەیەنێ، لێرەوە ئەم تێکستە پێویستی

بەهاوکاریی خوێنەرە لە شیکردنەوە و داهێنانەوەی. لەبەرئەوە دەبینین زانستی سیمیۆلۆژی (= نیشانەناسی- Semiologie)، گرینگی بەخوێنەری نموونەیی یان خوێنەری مۆدێل (Lecteur modele) دەدا و ئامادەی دەکا، ئەمەش خوێنەرێکی نموونەییە کە نەک هەر تەنیا ئەو توانایانە پێشان دەدا لە ڕێگای ئەمەوە لە مەبەستەکانی نووسەر دەگا، بەڵکو دەتوانێ لەوەش بگا کە تێکستەکە نایڵێ یان ڕاستەوخۆ نایگەیەنێ کە وەک مانایەک لەپشت تێکستەکە شاراوەیە. تێکست وەک کێڵگەیەک وایە لە ناوەوە چالاکە کە تێیدا نووسراو، (ئەوەی نووسراوە) بەهاوکاریی نیشانەکان، خوێنەر دەگرێ و دەیجووڵێنێ، لێرەوە، ئەم هاوکارییە بەشێکە لەو ستراتیژییەی کە لەلایەن دانەر یان نووسەرەوە دارێژراوە.

ئێکۆ لە کتێبی (سنوورەکانی شیکردنەوە- Limite de L'inter-prétation) کە لەساڵی ١٩٩١دا بڵاوی کردەوە، جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم پێوەندییەی نێوان دانەر (نووسەر) و خوێنەر. هەوڵی پێناسەکردنی شیکردنەوە و لێکدانەوە دەدا، هەڵبەت وێڕای تەواوی ئەو شیمانانەی (= احتمال) لێی دەکەوێتەوە. ئەگەر تێکستێک بتوانێ هەموو مانایەک لەخۆی هەڵبگرێ، ئەوا هەموو شتێک دەڵێ و چرووک و بێ مانا دەکەوێتەوە. جا بۆ ئەوەی شیکردنەوە و لێکدانەوە بشێ و بگونجێ دەبێ سنووری بۆ بدۆزرێتەوە و سنووردار بکرێ. بۆ ئەوەی تێکست بتوانێ مانایەک بەرهەم بهێنێ دەبێ کۆتایی هەبێ.

ئێکۆ لەبارەی زمانیش لێکۆڵینەوەی هەیە، لە کتێبی (گەڕان بەدوای زمانی پوخت.) دەیەوێ بڵێ، زمانی جیهانی، زمانێکی تایبەت و جیاواز، زمانێکی ڕەسەن و ئۆتۆپیایی یان دروستکراو نییە، بەڵکو زمانێکە بەشێوەیەکی نموونەیی لە هەموو زمانێک پێکهاتووە.

ئێکۆ پرۆفیسۆر و، تۆژەرەوە و مێژوونووسە، لە هەمان کات ڕۆماننووس. تەواوی تیۆرییەکانی لە ڕۆمانەکانی دەدۆزرێتەوە.

ڕۆمانە ناسراوەکانی بریتین لە (ناوی گوڵە باغ- Le Nom de la

Rose) کە لە ساڵی ١٩٨٠دا چاپکراوە. ڕۆمانی (پەندۆلی فووکۆ- Le Pendule Foucault) کە لە ساڵی ١٩٨٨دا چاپکراوە.

لەم ڕۆمانانە ئێکۆ تێکەڵاوێک لە خەیاڵی باتنییەت و سەلیقە و پشکنینی پۆلیسی دەخاتە ڕوو، لە ڕێگای پێشاندان و گەڕان بەدوای نهێنییەک، ئیشارەیەک، لاسایی کردنەوەیەک، یان لە ڕێگای ڕستەیەک، بەشێوازێکی خەست و تۆکمە و خوێنەر ڕابکێشن، ڕۆمانەکانی داڕشتوون. لە ڕۆمانی یەکەم کە سەردەمی ڕووداو دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٢٧، نووسەر لەسەر زەمینەی گرفتێکی سیاسی و ئایینی و بێ باوەڕی و پشکنین و موحاکەمە ئاینییەکان ڕووداوێک دەگێڕێتەوە، کە لەیەکێ لە دێرە گەورەکان زنجیرەیەک کوشتن ڕوودەدەن و قەشەیەکی فرانسیسکان هەوڵی هەڵماڵینی ئەو نهێنییە دەدا. ڕۆمانی دووەم بریتییە لە تێکەڵاوێک لە مێژوو و ژیانی هاوچەرخ. ڕووداوی ئەم ڕۆمانە لە چەند سەدەیەک ڕوودەدا، باسی چوونە ناو و خۆتێخستنێکی نهێنی دەکا بۆ ناو گرووپێکی سەر بەمەزهەبی باتنی. هەرچی ڕۆمانی (L'ile du jour d'avant) باس لە چینی نۆبڵ- بەگزادە خاوەن زەوی و زارە گچکەکان دەکا کە لەسەدەی حەڤدەم ژیاون. ئەمەیان زیاتر ڕۆمانێکی عاتیفییە و نووسەر لە ڕێگای پۆرترێتی یەکێکی دیکە کە لە ڕۆمانێکی دیکە ژیاننامەی نووسراوەتەوە، باسی ڕەگ و ڕیشەی خۆی دەکا.

**ڤالتێر بنیامین (١٨٩٢ - ١٩٤٠)**

زۆرجار ڤالتێر بنیامین لە ڕیزی هزرڤان و بیرمەندەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت دادەنرێ، لە سالانی سی چەند مەقالەیەکی لە گۆڤارەکەیان (گۆڤاری تۆژینەوەی کۆمەڵایەتی)دا بڵاوکردۆتەوە.

ڤالتێر بنیامین، لە ئەڵمانیای ڤایمار بەیەکێک لە هزرڤانە سەرسەخت و تەنیای دەرەوەی تەواوی تەوژمە فکرییە باوەکانی ئەو سەردەمە دادەنرێ، بێگومان هۆی ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ بێ فیزی خۆی، بەڵکو بەپلەی یەکەم بۆ هەڵوێستی ڕادیکالی خۆی.

هاوڕێ نزیکەکانی بریتی بوون بێجگە لە ئەدۆرنۆ – T. W. Adorno– کە لەگەڵ ماکس هۆرکهایمەر – Max Horkheimer– بەدامەزرێنەری تیۆریی ڕەخنە دادەنرێن، هەندێ بیرمەندی دیکەی ڕوانین جیاواز و لێک دووریش بوون، وەک: گێرشۆم شۆلێم – G. Scholem – و برتۆڵد برێخت – B. Brecht –. لە نووسینەکانی بەرایی کە زیاتر دەربارەی پێوەندیی ئەقڵ و زمانە –Laungage–، کاریگەریی ڕۆمانتیزم لە هامان – Ha-mann–ەوە بۆ شلیگل – Schlegel – و جودایزم (ئایینی جوولەکە – Ju-daisme) بەشێوەیەکی ئاسایی دەبینرێ. وەک لەو بابەتەی دەربارەی هۆڵدرلین – Holderlin– و دواتر لە بابەتی دیکەی خەست و چڕی دیکە وەک: هەوڵی وەرگێڕ، فەلسەفەی توندوتیژی، پرۆگرامی فەلسەفەی داهاتوو.

دەتوانین بڵێین نووسینە ئاڵۆزەکانی ساڵانی بیستی ئەو لەم نووسینانەی بەرایی دەرهاتوون و ئەمانەش دەربارەی گەلێک کێشەو بواری جیاجیان کە ئەو ڕوانینە دەوڵەمەند دەکەن کە (هونەر گرەوێکە). بەم چەشنە لە لێکۆڵینەوەکەی ساڵی (١٩٢٠)یدا: چەمکی ڕەخنەی هونەری لای ڕۆمانتیکەکان، یان تێزەکەی: بنچینەی تراژێدی بارۆک – کە لە ساڵی ١٩٢٥ پێشکەشی زانکۆی فرانکفۆرت کرد و ڕەت کرایەوە، لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش نووسەر کۆمەڵێک ڕەهەند و ئاراستەی دابووە لێکۆڵینەوەکەی. پێوەندیی نێوان ئەقڵ و زمان لە تەواوی ئەم نووسینانە ئامادەییان هەیە و ئەمانەش لە دەوری دوو خاڵی لێک نزیک دەخولێنەوە، وەک: سروش – Revelation– و تراژێدی. ئەمانەش هەریەکەیان زەمینەکەیان دەگەڕێتەوە، یەکەمیان بۆ (ناولێنانی–Nomination)ی تەورات، دووەمیان بۆ مەسەلەیەکی وەک (گیانی منداڵانە – In-fantilisme)ی پاڵەوان ئامێزی دەستەوەستاو بەرامبەر بەگوتە و وشەی نوێ.

ڤالتێر بنیامین لە تێزەکەی هەندێ ڕوانینی نوێی دەربارەی (ڕەمز – Al-

legorie) پێشکەش کردووە کە بەشێوەیەکی ناعادیلانە لەلایەن ئێستێتیکی کلاسیکی هەڵقولاو لە جیهانی گۆتە - Goethe وەلانراوە. ئەم ڕوانین و تەکنیکانەی بنیامین دەربارەی ڕەمز پێشکەشی کردوون و سەرلەنوێ هێناویەتییەوە بۆ ناو تیۆریی ئەدەب، لەسەر بنچینەی جێگۆڕکێی - Intermitence-ی ئیماژ و فکرەیە، یان (دلاله و مدلول)ە.

لەم سەردەمەی ژیانی ئەدەبی و فکریی ڤالتێر بنیامین وردە وردە و زۆرتر بەرەو شێوەیەک لە ماتریالیزمی مێژوویی دەچێ، هەڵبەت بێ ئەوەی پشت لە نووسینەکانی پێشووی بکا. لێرەوە ڕێساکانی لە چواردەورەی دوو جەمسەری دژ بەیەک دروست دەبێ و بڵاو دەبێتەوە، ئەمانەش = میتافیزیکی زمان و سیاسەتی مارکسیستانەیە. لە ئەنجامی ئەم دژ بەیەکە بەرهەمهێنەرەدا نووسەر میتۆدێکی ڕاستەقینەی دروست کردووە و ئەمەش سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێزەکەی - بنچینەی تراژێدی بارۆک، کە لەوێ وەک زەمینەیەک ڕوانینەکانی پەیڕەو کردووە.

لەلایەکی دیکە بەگوێرەی ڕوانینی ڤالتێر بنیامین، باشترین فۆرمی ئەدەبی کە دەتوانێ تەعبیر لەم بیر و ڕوانینەی ئەو بکا و خۆی تێدا بدۆزێتەوە، نرخ و بەها ڕەخنەییەکان پێشان بدا، Commentaire-ە، واتە شەرح و مانا لێکدانەوەیە. لەم بارەیەوە دەڵێ: ئەگەر بشێ، دەتوانم بڵێم تەنیا لە ڕووی تیۆلۆژییەوە توانیومە گەشە بەلێکۆڵینەوەکانم بدەم، بێگومان بەپێکچوواندن و بەرامبەر یەکتری دانان و بەیەکتری گرتن لەگەڵ ڕێبازی تەلموودی هەر چل و نۆ ئاستی مانا لە هەر پارچەیەکی تەورات. جا بەگوێرەی تاقیکردنەوەکانم، بێ مانایی و گێلی هەرە دیاری کۆمۆنیزم پڕ لە مانای هەرەمیترە لە چاو قووڵیی بیری بۆرژوازیی هاوچەرخ، کە تەنیا خاوەن مانای ستایشە - Apologie. بەم جۆرە شەرح و مانا لێکدانەوە دەبێتە ئامێرێکی دروست کردن کە تێیدا کاری هونەری. دوور لە تەمومژی میتۆلۆژی کە وا لەم کارە دەکا خۆی بێ، ببێتە بەرهەمی ڕۆژ، ئەمەش بەجۆرێک لەناوبردن و ڕزگارکردن. پرۆسەیەکی لەم جۆرە دەشێ میراتێکی

ئەدەبی پێ لێک بدرێتەوە، هەروەها کارە ئەدەبییە هاوچەرخەکانیش، وەک بەرهەمەکانی کافکا و کرۆس و پرۆست.

لە تێکستەکانی سالآنی سی وەک: پاریس پایتەختی سەدەی نۆزدەم (کە بەناتەواوی ماوەتەوە.) هەست بەهەوڵدانێکی شێلگیرانە دەکرێ لە بواری تیۆریی ماتریالیزمی هونەری. لە بابەتێکی بەناوی: هونەر لەسەردەمی بەرهەمهێنانی تەکنیکی و هی دیکەش، بەپێچەوانەی ڕوانینی سۆسیۆلۆژیزم-ی ئەو سەردەم بیردەکاتەوە، دژی ڕوانینی ستالینییانەیە بۆ ئەدەب و هونەر کە دەڵێ ئەم دوو شتە دەبێ ڕەنگدانەوەی واقیعیان تێدابێ بەرهەمی ئەوبن.

لە سەردەمی بەرهەمهێنانی تەکنیکی، هەروەکو چۆن بۆدلێر لە شەقامەکانی پاریس، ئەو بازنە ڕووناکییەی (هالە مقدسە) هەردەم لەسەر سەری بوو کەوتە خوارەوە، ئەدەب و هونەریش بەهەمان شێوە هەمان بازنەی ڕووناکییان بزر کرد. لە بەرامبەر ئەوە، ڤالتێر بنیامین پشت بەتەکنیک دەبەستێ، گرینگیی بەفۆتۆگراف و سینەما دەدا، بەڵکو بکرێ لە ڕێگای ئەمەوە گیانی (طقس) ئاسا لە ئەدەب و هونەر داببرێنرێ و ئەم دوو شتە بەسیاسی بکرێ. (بەپێچەوانەی فاشیزم کە هەوڵ دەدا سیاسەت جوان بکا.) لەلای ئەو ئەم بەسیاسی کردنە هەر تەنیا لە ناواخنەوە نابێ، بەڵکو دەبێ لە فۆرم و کاریشدا بێ. هەر لەبەر ئەوە دەبینین وشەی دانەر بەرامبەر بە بەرهەمهێنەر بەکاردەهێنێ.

هیچ چەمکێک بۆ ڤالتێر بنیامین بێگانە نییە، لێرەوە دەبێ ئاماژە بەو ڕوانینە بدەین کە بەگوێرەی ئەو هیچ بەردەوامی و تەواوکەرێک لەنێوان تیۆرییەکەی خۆی کە بە(تیۆریی ماتریالیزمی هونەری) دادەنرێ، هەروەها ئەو تێزەی دەربارەی فەلسەفەی مێژوو کە ئەمیش پێش خۆکوشتنی لە ساڵی ١٩٤٠ نووسیویەتی، نییە. قسە بەناوبانگەکەی لەمەوە دەرهاتووە کە دەڵێ: (هیچ دۆکیمەنتێکی کولتووری نییە لە هەمان کات دۆکیمەنتێکی بەربەری نەبێ.) ئەو دژی تەواوی بەمێژووکردنەکانە و

لەگەڵ ئەوەدا نییە مێژوو بۆ مەبەستی پێچەوانە بەکاربهێنرێ، دەبێ لێگەڕێین مێژووی خۆی بمانبا یان لەناو (مانا)کانی مەلە بکەین، چونکە کە لە بەرامبەر کارەساتین: ڤالتێر بنیامین لێرەوە جارێکی دیکە تیۆلۆژی و مارکسیسزم لەبەرامبەر یەکتری دادەنێ، ئەمەش وەک چەمکێکی داواکراوی سەردەمی مێژوویی، دەبینین لەم هەنگاوە نووسەر زیاتر بەرەو ڕوانینێکی (باطنی-Esoterique)ی بێ نموونە دەچێ. لەم ڕووەوە، هاوڕێکانی، یەکێکی وەک برێخت کە هیچ کاتێک تێگەیشتنێکی وای بۆ هزرو بیری ئەو پیشان نەداوە، لەم بارەیەوە دەڵێ: ئەمە حەقیقەتێکی ڕووتە، هەر لەبەر ئەم خاڵەشە ناچێتە عەقڵەوە.

# پێرست